لە گەڵ پایەداراندا

( ١ )

## زانای پایە بەرز

# ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

نوسینی :

**باوكي يوسف**

**م . مەجید حەمید مەجید**



1428 کۆچی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وكفى ، والصلاة والسلام على نبيه المصطفى ، وصحبه الـــمجتبى ...
أما بعد :-

كاتێـك نوسـەرێك ژياننامـەى كەسـێك دەنوسـێت ديـارە ئـەو كەسـە چـەند رەوشتێكى تيادايە كە لە كەسانى تـردا نىيـە يـان كەمـە ، جـا لێـرەدا مەبەسـتم نوسينە لە سەر (ئيمامى ئەحمەدى كورِى حەنبەل) كە چەند هۆكارێك هەبوون بۆ دەستنيشـان كردنـى ئـەم كەسـايەتىيە پايـەدارە ، چـەند رِەوشـت و سـيفاتێكى تيادابوو كە لە خەڵكانى ئەو سەردەمەى خۆيـدا نـەبووە و بـەو شـێوە لـە كەسـى تردا كۆ نەبووەتەوە لەوانە : ـ

١. ئيمامى ئەحمەد كابرايـەكى زانـا و زاهيـد و فەقيـە و فـەرموودەناس و لـە خواترس بوو .
٢. ئەو (علم)ـەى كە پێى بوو كردەوە و (عمل)ى پێ دەكرد .
٣. بـە جۆرەهـا شـێوە تاقيكرايـەوە و لـە هەموويشـيدا بـە سـەركەوتوويى دەرچوو .

وە چەندين خاڵى تر .

وە من لە نوسـينى ئـەم كتێبـەدا پـەيرِەوێكم هەڵبـژاردووە خـۆم و بـە باشـم زانيوە ئەويش ئەوەيـە كـە بـە زمـانێكى سـادە و سـاكار و دوور لـە رەوانبێـژى و خۆماندوو كردن لـە هێنانـەوەى وشـەى گـران دا كـە زۆر جـار نوسـەر لـە ئامـادە كردنيدا ماندوو دەبێت و براى خوێنەريش ماندوو دەبێـت بـۆ دۆزينـەوەى مانـاى وشەكە و تێگەيشتن لـێى ، جـا بـە باشـم زانـى كـە بـە زمـانێكى پـاراو و سـادە مەبەستەكە بە خوێنەر بگەيەنم .

نوسەر

م. مجيد حميد مجيد / **كفرى**

# پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

## ناو و نەسەبی : ـ

ناوی ئەم پێشەوایە باوکی عبدالله (**أحمد**)ی کوڕی (**محمد**)ی کوڕی (**حنبل**)ی کوڕی (**هلال**)ی کوڕی (**أسد**)ی کوڕی (**ادريس**)ی کوڕی (**عبدالله**)ی کوڕی (**حيان**)ی کوڕی (**عبدالله**)ی کوڕی (**أنس**)ی کوڕی (**عوف**)ی کوڕی (**قاسط**)ی کوڕی (**مازن**)ی کوڕی (**شيبان**)ـە [1] .

ئیمامی ئەحمەد لە سکی دایکیدا دەبێت کە باوکی لە شاری (مرو)ەوە چوو بۆ بەغدا و لەوێ لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (١٦٤)ی کۆچی لە دایك دەبێ [2] ، وە باوك و باپیری خۆی نەبینیوە چونکە لە تەمەنی سێ ساڵیدا دەبێ کە محمدی باوکی لە تەمەنی سی ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات ، بۆیە کەس بە ناوی باوکییەوە نایناسێتەوە چونکە باوکی موجاهید بووە و ناوبانگی نەبووە بەڵام باپیری (حنبل) والی بووە لە (سرخس) و خەڵکی ناسیویەتی و ناوبانگی بووە ئێستا دەڵێن (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) وە حەنبەل یەکێك بووە لەوانەی کە بانگەوازیان بۆ خیلافەتی عەباسی کردووە لەسەردەمی ئەمەویدا چونکە ئەوی بە ڕاستتر زانیوە [3] .

وە دایکی ئیمامی ئەحمەد ناوی (صفية)ی کچی (ميمونة)ی کچی (عبد الملك)ی کوڕی (سوادة)ی کوڕی (هند)ی شيبانی بووە [4] پاش کۆچی دوایی باوکی ئەم دایکە بە سۆزە ئیمامی ئەحمەد بە خێو دەکات ، لێرەدا بۆمان

---

[1] البداية والنهاية :( ١٠ / ٢٧٣ ) ، مناقب الامام احمد بن حنبل : (١٦) ، طبقات الحنابلة : (٤) ، الائمة الأربعــة : (١٥٩) ، حلية الاولياء : (٩ / ١٦٢) ، تاريخ بغداد : (٤ / ٤١٤) ، سير أعلام النبلاء: (٤٥٥/٧) ، طبقات الشافعية: (٥٦/٢) .

[2] البداية والنهاية :(٢٧٣/١٠ ) حلية الأولياء : (٩ / ١٦٢ ــ ١٦٣)،المناقب :(١٣)، ابن حنبل:(١٢) ،الائمة الاربعــة: (١٥٨) ،تاريخ بغداد: (٤١٥/٤) ، سير أعلام النبلاء : (٤٥٥/٧ )،طبقات الشافعية : ( ٥٨/٢)،طبقات الفقهاء:(١٠١/١) .

[3] ابن حنبل : (١٤) ، المناقب : (١٥) ، الأئمة الأربعة : (١٥٩) ، سير أعلام النبلاء : ( ٤٥٨/٧ ).

[4] المناقب:(١٩)، الائمة الأربعة: (١٥٩ ) .

دەردەکەوێت کە دایك و باوکی ئیمامی ئەحمەد لە بەنی شیبانن[٥] بۆیە زۆر جار ئەگەر بڕۆیشتایە بۆ شاری بەسرە لە مزگەوتی بەنی مازن نوێژی دەکرد و دەیفەرموو: ئەمە مزگەوتی باوباپیرمە [٦]. وە خێڵی (بەنی شیبان) لە بەصرەدا زۆر بوون بۆیە بە ئیمامی ئەحمەد دەڵێن (بەصری)[٧].

## گەڕان بە دوای زانستدا

ئیمامی ئەحمەد هەر لە منداڵی‌یەوە ئارەزووی لە وەرگرتنی زانست کردووە لە ژێر دەستی مامۆستاکان و زاناکانی بەغدادا پەروەردە بووە[*] ، ئیمامی ئەحمەد بە هەتیوی گەورە بووە و زۆر دایکی خۆش دەویست تەنانەت دەڵێ : جارێکیان لە کووفە ڕۆیشتمە دەرەوە تووشی سەر ئێشە بووم بۆیە گەڕامەوە بۆ لای دایکم چونکە مۆڵەتم لێ وەرنەگرتبوو[٨] ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە گومانی ئەوەی بووە هۆی سەر ئێشەکەی ئەوە بووە کە بە بێ پرسی دایکی لە ماڵ دەرچووە ، زۆر جار دایکی بەزەیی پێدا دەهاتەوە کە چەند ماندوو دەبێت بۆیە جاری وا بوو جلوبەرگەکەی لێ دەشاردەوە چونکە ئیمامی ئەحمەد بەردەوام پێش شەبەق دەڕۆیشتە دەرەوە بۆ وەرگرتنی زانست[٩] ، وە جاری وابوو هێندە زوو دەچوو بۆ وەرگرتنی زانست تەنانەت دایکی دەیفەرموو : کوڕم جارێ با لە خەو هەستن[**] .

---

[٥] ابن حنبل : (١٢) .

[٦] ابن حنبل : (١٣) ، المناقب : (١٩) .

[٧] المناقب : (٢١) ابن حنبل: (١٣ ) ،الائمة الاربعة: (١٥٨) .

[*] المناقب :(٢٠) ، علوم الحديث ومصطلحه :(٣٩٤) ، تاريخ بغداد : (٤١٢/٤) .

[٨] المناقب:( ٢٥) ،الائمة الاربعة:( ١٥٩).

[٩] المناقب:( ٢٦ ) ،الائمة الاربعة :(١٦٠) .

[١٠] الحديث والمحدثون :( ٣٥١)، ابن حنبل: (٢٠)،المناقب : (٢٣)،الائمة الاربعة : (١٦٠)،البداية والنهاية:(١٠\٢٧٣) ، سير أعلام النبلاء: (٤٦١/٧).

[**] المناقب :( ٢٦) ، ابن حنبل : ( ٢٣) .

ئیمامی ئەحمەد لە سەرەتای ژیانیدا قورئانی پیرۆزی لە بەر کرد ئەمجار ڕووی کردە کۆڕ و کۆمەڵی (أبو یوسف) کە یەکێ بووە لە قوتابیيە گەورە و زیرەگەکانی ئیمامی (أبي حنيفة)، ئیمامی ئەحمەد چەند کتێبێکی لە سەر بۆچوون (رأي) لە بەر کرد پاشان (أبو یوسف) بە جێ دەهێڵێت و ڕوو دەکاتە گوێ گرتن لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)[10] ، وە بە شوێن فەرموودەدا چوو بۆ یەمەن بۆ لای (عبد الرزاق) لە گەڵ (يحيى بن معين) و(إسحاق بن راهويه)دا وە دەڵێ : ئەگەر نەوەت دەرهەمم ببوایە دەچووم بۆ لای (جرير بن عبد الحميد) لە شاری (الري) هاورێکانم رۆیشتن چونکە توانایان بوو بەڵام من نەمتوانی بڕۆم چونکە نەمبوو [11] ، (حرملة) دەڵێ : گوێم لێ بوو ئیمامی شافعی فەرمووی:ئیمامی ئەحمەد بەڵێنی پێدام کە بێت بۆ لام بۆ میصر کە چی نەهات .

(ابن أبي حاتم) دەڵێ:رەنگەلەبەر دەست کورتی نەیتوانی بێت ئەو بەڵێنە جێبەجێ بکات[12] .

(أبو عفيفة) دەڵێت : ئیمامی ئەحمەد قوتابی بوو لە گەڵ ئێمەدا زۆر بەتواناو لێهاتوو بوو کاتێ کە خەلیفە لە (الرقة) بوو سەربازەکان نامەیان دەنووسی بۆ ماڵەوە ئەمجار خێزانەکانیان دەیاننارد بۆ لای مامۆستاکەمان کە ئیمامی ئەحمەدمان بۆ بنێرە بۆ ئەوەی وەڵامی ئەم نامەیانە بنووسێ ئەویش دەینارد، ئیمامی ئەحمەد کاتێ دەچوو سەری لە خوارەوە بوو تەماشایانی نەدەکرد و وڵامەکانی دەنووسی ئەگەر بیانگوتایە کە شتێکی خراپ بنووسە ئەوا

---

(١١) البداية والنهاية:(١٠\٢٧٤) ،الائمة الاربعة:(١٦٠)،المناقب:( ٢٥)،ابن حنبل:( ٢٤)، سير أعلام النبلاء :(٤٥٨/٧).

(١٢) البداية والنهاية:(١٠\٢٧٤) ،ابن حنبل:( ٢٦).

(١٣) المناقب:( ٢٠) ،ابن حنبل:( ١٨) .

(١٤) ابن حنبل:( ٢١) ،المناقب:(٢٢) ،الاعلام:(١٩٢/١) ،الائمة الاربعة : (١٦٠)، تاريخ بغداد: (٤١٢/٤) .

نەیدەنووسی [١٣] ، ئیمامی ئەحمەد بە شوێن زانستدا زۆر جێگا گەڕاوە لەوانە کووفە و پێنج جار چووە بۆ بەصرە لە ساڵی (١٨٦) و (١٩٠) و (١٩٤) و (٢٠٠) وە هەروەها چووە بۆ مەککە و مەدینە و یەمەن و شام و جەزیرە و پێنج جار چووە بۆ حیجاز و چەندەها جێگەی دی .[١٤] وە جاری وا بووە بە پێ دەچوو بۆ یەمەن و طەرسوس [١٥] ، جارێکیان کابرایەك ئیمامی ئەحمەدی بینی (محبرة) یەکی بە دەستەوە بوو کابرا فەرمووی : ئەی باوکی عبدالله گەیشتویتە ئەم تەمەن و زانستە و تۆ پێشەوای موسڵمانانی (محبرة) بۆ هەڵدەگری ؟ ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : لە (محبرة) وە بۆ (مقبرة) واتە گۆڕستان.

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : بە شوێن زانستدا دەگەڕێم تاکو دەچمە ناو گۆڕەوە [١٦] .

(محمد)ی کوڕی (اسماعیل الصایغ) دەڵێت : جارێکیان لە بەغدا بووین ئیمامی ئەحمەد بە تەنیشتمانەوە بە پەلە تێپەری و هەردوو نەعلەکەی بە دەستەوە بوو باوکم کراسەکەی گرت و فەرمووی: ئەی باوکی عبدالله ئایە شەرم ناکەی ؟ تاکەی لە گەڵ ئەو منداڵانەدا ڕادەکەیت ؟ ئیمامی ئەحمەد وەڵامی دایەوە و فەرمووی: تاکوو مردن [١٧] ، ئیمامی ئەحمەد هێندە تامەزرۆی زانست وەرگرتن بووە کاتێکی زۆری خۆی پێوە بردووەتە سەر، چەندەها سەفەری لە پێناوی دا کردووە تەنانەت کاتی ئەوەی نەبووە کە ژن بهێنێ تاکوو تەمەنی گەیشتە چل ساڵ [١٨] .

---

(١٥) المناقب:( ٢٨).

(١٦) المناقب:( ٣١) ،ابن حنبل:( ٢٦) ،الائمة الاربعة: (١٦٣) .

(١٧) المناقب :( ٣٢) .

(١٨) المناقب:( ٥٨ ) .

(١٩) المناقب :(٢٦٩).

(٢٠) المناقب :(٢٣ ) ، ابن حنبل : (٢٨ ) ، تاريخ بغداد (٤١٦/٤).

## گوێ گرتن لە فەرموودە

یەکەم جار کە پێشەوا دەستی کرد بە گوێ گرتنی فەرموودە بوو بە قوتابی لای (هُشَیم) لە ساڵی (١٧٩) کە تەمەنی شازدە ساڵ بوو[٢٠] ( هُشَیم بن بشیر بن أبي حازم) : پێشەوای فەرموودەناسان لە شاری بەغدا ژیاوە لە ساڵی (١٠٤) لە دایك بووە و لە ساڵی (١٨٣) کۆچی دوایی کردووە یەکێکە لە (تابعی تابعی)یەکان چەند (تابعی)یەکی دیوە وەك (عمرو بن دینار) و( الزهري) موسڵمانێکی زۆر لە خواترس بووە ئیمامی مالك فەرموودەی لێ گێڕاوەتەوە زۆر زیرەك و لێهاتوو بووە هەرگیز ئیمامی ئەحمەد پرسیاری لێ نەدەکرد، لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا جارێك یان دوو جار ئیمامی ئەحمەد پرسیاری لێکرد لە شەرم و هەیبەتی (هُشَیم) دا [٢١] وە هەر لەم ساڵەدا چوو بۆ مەجلیسی (ابن مبارك) فەرموویان:— چووە بۆ طەرسوس [٢٢]وە هەر لەم ساڵەدا (حماد بن زید) و (مالك بن انس) و (خالد بن عبدالله الطحان ) و (أبو الأحوص) کۆچی دواییان کرد .

(أبو سراج) دەڵێ : کاتێ باسی ئیمامی ئەحمەد بکرایە باوکم دەیفەرموو :— من پارەیەکی زۆر بۆ منداڵەکانم خەرج دەکەم و نازیان هەڵدەگرم بۆ ئەوەی سەر بکەون کەچی سەر ناکەون بەڵام ئیمامی ئەحمەد بەبێ ناز و بەبێ باوك تەماشا کەن چۆن سەر دەکەوێت ! ! [٢٣] .

ئیمامی ئەحمەد هەر لەم ساڵەدا واتە ساڵی (١٧٩) فەرموودەی لە (علي بن هاشم بن برید) وەرگرد و هەر لەم ساڵەدا جارێکی دی گەڕایەوە بۆ لای بەڵام کۆچی دوایی کردبوو [٢٤] ، وە لە ساڵی (١٨٢) فەرموودەی لە (عبد المؤمن بن

---

[٢١] ابن حنبل : (٩٤ ).

[٢٢] ابن حنبل: ( ١٠٠ )،حلية الاولياء:(٩ :١٦٢)، سير أعلام النبلاء :( ٤٥٨/٧) ، تاريخ بغداد : ( ٤١٦/٤) .

[٢٣] المناقب:( ٢١) ،ابن حنبل:( ١٨) .

[٢٤] المناقب:( ٢٤) .

عبدالله بن خالد) وەرگرت[٢٥].

ئيمامى ئەحمەد لە تەمەنى بيست ساڵيدا دەبێت واتە ساڵى ١٨٣ كاتێ كە(هُشَيم)ى مامۆستاى كۆچى دوايى دەكات وە لە ماوەى ئەو پێنج ساڵەدا واتە لە ساڵى ١٧٩ تاكو ساڵى ١٨٣ زياتر لە سێ هەزار فەرموودەى لێ وەرگرت[٢٦] ، وە ئەوەى كە لە (هُشَيم)ـەوە بيستبوى لە بەرى كرد بوو هێشتا (هُشَيم) زيندوو بوو[٢٧].

وە لە ساڵى ١٨٧ ئيمامى ئەحمەد چوو بۆ لاى (سفيان بن عيينة) وە دەڵێ : لاى (سليمان بن حرب) فەرموودەم دەنووسى (ابن عيينة) زيندوو بوو وە لە ساڵى ١٩٤ لە بەصرە گوێم گرت لە (سليمان بن حرب) و (أبي النعام) و (قارم) و(أبي عمر الحوض) ، وە لە ساڵى ١٩٨ لە يەمەن دەبێ لاى (عبد الرزاق) هەواڵى كۆچى دوايى (سفيان بن عيينة) و( عبد الرحمن بن مهدي) و (يحيى بن سعيد)ى پێ دەگات[٢٨].

## لە كاتى زانست وەرگرتندا

لە كاتى زانست وەرگرتندا هاوەڵانى ئيمامى ئەحمەد زۆر ڕێزيان لێ دەگرت و زۆر خۆشيان دەويست ئەوەتا (أبو بكر الأثرم) دەڵێ : جارێكيان لاى (إسماعيل بن علية) بوين ئيمامى ئەحمەد هاتە ژوورەوە كەس نەمايەوە لەژوورەكەدا بە بێ جوڵانەوە بۆ ڕێكخستنى جێگايەكى شياو بۆ ئيمامى ئەحمەد[٢٩].

---

[٢٥] المناقب:( ٢٥) .

[٢٦] المناقب:( ٢٢) ،ابن حنبل:( ٢٢)،الائمة الاربعة:( ١٦٢) ، سير أعلام النبلاء : (٤٥٨/٧) .

[٢٧] المناقب:( ٥٩) ، سير أعلام النبلاء : (٤٥٨/٧) .

[٢٨] المناقب :(٢٣) .

[٢٩] المناقب:(٢٢) .

ئیمامی ئەحمەد ماوەیەك قوتابی بوو لای (یحیی بن سعید القطان) پاشان چوو بۆ (واسط)، (یـحیی) پرسیاری كردبوو : ئیمامی ئەحمەد كوا ؟ وەڵامیان دایەوە : چووە بۆ (واسط) ، ئەویش فەرمووی : چی دەكات لە (واسط) ؟ فەرموویان: چووە بۆ لای (یزید)ی كوڕی (هارون) بۆ وەرگرتنی زانست ، (یحیی) فەرمووی : لای یزید چی دەكات ؟ مەبەستی ئەوەیە كە ئیمامی ئەحمەد لە (یزید) زیاتر دەزانێت .

هەروەها (إبراهیم بن هاشم) دەڵێ : كاتێ كە(جریر بن عبد الحمید) هات بۆ بەغدا لە ساڵی ١٨٦ لە (بني مسیب) جێگیر بوو چووە بەشی ڕۆژهەڵات (الجانب الشرقي) ئاوی دیجلە هاتبوو، بە ئیمامی ئەحمەدم گوت: بابڕۆین بۆ لای (جریر) ، ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : نایەم چونكە دایكم ڕێی پێ نەداوم [٣٠] (ابن منیع) دەڵێ : باپیرم فەرمووی : جارێكیان ئیمامی ئەحمەد بە تەنیشتمەوە تێپەڕی لە كووفەوە دەهات و چەند كتێبێكی بە دەستەوە بوو منیش دەستی ئیمامی ئەحمەدم گرت و پێم ووت : جارێك بۆ كووفە و جارێك بۆ بەصرە تاكو كەی ؟ ئەگەر كەسێك سی هەزار فەرموودە بنووسێ بەسی نییە؟ ئیمامی ئەحمەد هیچی نەگوت ، ئەمجار ووتم : شەست هەزار ؟ ئیمامی ئەحمەد هیچی نەگوت ، ئەمجار ووتم : سەد هەزار ؟ ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : ئەو كاتە شتێك دەزانێ . (ابن منیع) دەڵێ : بینیمان ئیمامی ئەحمەد سێ سەد هەزار فەرموودەی لە (بـهز بن أسد) و (عفان)ەوە نوسیوە وابزانم فەرمووی : لە (روح بن عبادة) یشەوە [٣١] .

(شاذان) دەڵێ : پرسم بە ئیمامی ئەحمەد كرد ئایە لە (حماد)ەوە لە (قتادة) وە لە (عكرمة) وە لە (ابن عباس)ەوە فەرموودە بگێڕمەوە ئەویش ڕێی پێ دام [٣٢] .

---

[٣٠] المناقب:( ٢٧) .

[٣١] المناقب:( ٢٩) .

[٣٢] المناقب:( ٨٥).

## گێڕانەوەی فەرموودە

ئیمامی ئەحمەد لە ساڵی ١٩٨ لە مزگەوتی (الخیف) دەیانبینی پشتی دەدایە دنگەیەکەوە و ( أصحاب الحدیث ) دەهاتن ئەویش فێری( فیقه) و (حدیث) ی دەکردن فەتوای بۆ خەڵکی دەدا دەربارەی (المناسك)[٣٣] . بەڵام وەکو مەجلیسێکی تایبەت بە خۆی دانابێ ڕۆژانە خەڵکی سەردانی بکەن ئەوە لە ساڵی ٢٠٤ بوو کە تەمەنی ئیمامی ئەحمەد چل ساڵ بوو [٣٤] ڕەنگە لە پێش ئەو کاتە هۆی نەگێڕانەوەی فەرموودە ئەوە بوو بێ کە زۆر بەی مامۆستاکانی زیندوو بوونە و ئەویش شەرمی کردووە کە مامۆستای زیندوو بێت و ئەویش فەرموودە بگێڕێتەوە وە یاخود حەزی کردووە کە تەمەنی بگاتە چل ساڵ کە ئەوە تەمەنی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) کاتێ کە وەحی بۆ هات وە تەمەنی کامل بوونی مرۆڤە لە چەند ڕوویەکەوە .

(الصیرفـي) دەڵێ : لە گەڵ ئیمامی ئەحمەد دا بووم لە پێش دەرگای ماڵی ئیمامی ئەحمەد فەرموودەیەکی بۆ گێڕامەوە کە (عبد الرزاق) ریوایەتی کردبوو ووتم : ئەی باوکی عبد الله دووبارەی کەرەوە تاکو بینووسم، فەرمووی : ئەی باوکی جەعفەر چی لێ دەکەی ؟ (عبد الرزاق) زیندووە ، ووتم : باوەرم پێ دەکەی ؟ فەرمووی : بەڵێ . ووتم : سوێندت بۆ دەخۆم ئەگەر بۆم بگێڕیتەوە پاشان لەم دەرگا چوومە دەرەوە و( عبد الرزاق)م لە سەر کۆڵانەکە بینی پرسیاری لێ ناکەم .[٣٥]

جارێکیان ئیمامی ئەحمەد فەرموودەی بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە کابرایەکی خەڵکی (مرو) پرسیارێکی لێ کرد دەربارەی فەرموودەیەك ئیمامی ئەحمەد

---

[٣٣] المناقب :( ١٨٧) ،ابن حنبل :(٣٤) ،حلية الاولياء :(٩ / ١٦٤) ، سير أعلام النبلاء : (٤٦٣/٧)

[٣٤] المناقب:( ١٨٨) ،ابن حنبل :(٣٣).

[٣٥] المناقب:( ١٨٨) ،ابن حنبل:( ٣٣).

فەرمانى كردە عبدالله ى كوڕى كە كتێبى (الفوائد) ى بۆ بهێنێ ئەويش هێناى ئەمجار بە شوێنيدا گەڕا و بەڵام نەيدۆزييەوە پاشان خۆى هەستاو چووە ژوورەوە زۆرى پێ نەچوو گەڕايەوە بۆ لاى جەماعەت و چەند كتێبێكى بە دەستەوە بوو ئەمجار دانيشت و بە شوێنيدا گەڕا زۆرى پێ چوو ، كابرا كە پرسيارەكەى كردبوو فەرمووى : باوكى عبدالله ماندوو بويت وازى لێ بهێنە . ئيمامى ئەحمەد فەرمووى : نەخێر خۆمان پێويستمان پێيەتى ئەمجار بينيان ديسان چووە ژوورەوە تەماشاى كتێبەكانى دەكرد وە هەرچى كتێبێك تەماشاى بكردايە لەماڵەوە تەماشاى نەدەكرد بەڵكو دەهاتە ناو مەجليسەكەو تەماشاى دەكرد چونكە پێى ناخۆش بوو ئەو كۆمەڵە خەڵكە بە جێ بهێڵێ .[٣٦]

## مامۆستاكانى ئيمامى ئەحمەد

هەروە كو باسمان كرد كە (أبو يوسف) ئەو مامۆستايە بوو كە ئيمامى ئەحمەد يەكەم جار رووى كردە كۆڕ و كۆمەڵەكەى بۆيە بە يەكەم مامۆستاى ئيمامى ئەحمەد دەژمێردرێت بەڵام لێكۆڵەرەوان دەڵێن : (أبو يوسف )زۆر كاريگەرى نەبووە لە سەر ئيمامى ئەحمەد بەڵكو (هشيم بن بشير بن ابي حازم الواسطي) بە يەكەم مامۆستاى دێتە ژماردن وە (ئيمامى شافعى) بە دووەم مامۆستاى دەژمێردرێت يەكەم جار لە حيجاز يەكيان بينى ساڵى ١٨٧ كاتێ ئيمامى ئەحمەد چوو بۆ حەج (ئيمامى شافعى) لە (مسجد الحرام) خەريكى وانەوتنەوە بوو لەوەوە چەند فەرموودەيەكى وەرگرد و دووەم جار لە بەغدا يەكيان بينى كە ساڵى ١٩٨ بوو وە زۆر پێى خۆش بوو كە ئيمامى ئەحمەد لە گەڵيدا سەفەر بكات بۆ ميسر .

وە پاش ئەو چەند مامۆستايەكى دى وەكو ( عمير بن عبدالله بن خالد) و( عبدالرحمن بن مهدي) و( ابي بكر بن عياش ) و ( يحيى بن القطان) و (يزيد بن

---

[٣٦] ابن حنبل:( ٢٧) ،المناقب :(١٨٩-١٩٠).

زريع) و( عمر بن ايوب العابد) و (حسن بن محمد المروزي) و (سليمان بن داود الهاشمي ) و (ام عمر بنت حسان بن زيد الثقفي) كه ئافرەت بوو ...هتد) [٣٧].

ئيمامى ئەحمەد دەڵێ : ئيمامى(مالك)م له دەست دەرچوو خواى گەورە (سفيان ى كوڕى عيينه) ى له جێ بۆ دانام و (حماد ى كوڕى زيد) م له دەست دەرچوو خواى گەورە( اسماعيل ى كوڕى عەليه)ى له جێ بۆ دانام .[٣٨]

## ئيمامى ئەحمەد و شافعى

ئيمامى ئەحمەد يەكێكه له قوتابىيه هەره زيرەكەكانى ئيمامى شافعى و چەند فەرموودەيەكى لێ گێڕاوەتەوە كه نزيكەى بيست فەرموودە دەبێت، يەكێك لەو فەرموودانه ئەوەيه كه پێغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرموويەتى : (**نسمة المؤمن طائر تعلق في شجر الجنة حتى يرجعه الى جسده يوم البعث** ) وە له جارى دووەمدا كاتێ ئيمامى شافعى له گەڵ ئيمامى ئەحمەد دا يەكيان بينى له بەغدا ساڵى ١٩٨ تەمەنى ئيمامى ئەحمەد سى و چوار ساڵ بوو ئيمامى شافعى به ئيمامى ئەحمەدى فەرموو : ( ئەى باوكى عبدالله ئەگەر فەرموودەيەكى ڕاست ( صحيح)ت پێ گەيشت فێرم بكه با بڕۆم بۆ لاى جا ئەگەر فەرموودەكه حيجازى بوو يان شامى ، عێراقى بوو يان يەمەنى )[٣٩].

واته: وەكو فەقيهەكانى حيجاز ناكات تەنها فەرمودەيان له حيجازييەكانەوە وەردەگرد، به راستى ئەمه شايەتييەكى گەورەيه و ڕێزى ئيمامى ئەحمەد بەرزتر دەكات و ئەوە دەگەيەنێت كه ئيمامى ئەحمەد له ئيمامى شافعى بليمەت تر بووە له فەرموودەناسيدا . ئيمامى ئەحمەد چل ساڵ له

---

[٣٧]) ئيمامى ئەحمەد له زۆر مامۆستاوە فەرمودەى وەرگردووە زياتر له ٤٠٠ مامۆستا بووە ابن الجوزى له كتێبى (مناقب الامام احمد بن حنبل) ناوى زۆر له مامۆستاكانى هێناوە له لاپەرە ٣٣ تا ٥٦ ، وە بڕوانه : (سير اعلام النبلاء) (٧/٤٥٦) و (تاريخ بغداد) (٤/٤١٢-٤١٣) .

[٣٨] المناقب:( ٣٠) ابن حنبل:( ٣٢) .

[٣٩] البداية والنهاية:( ١٠:٢٧٤)،ابن حنبل:( ٢٤)،الطبقات:( ٦) الحديث والمحدثون:( ٣٥١)،سير اعلام النبلاء (٧/٤٧٦).

نوێژەكانیدا دوعای كردووە بۆ ئیمامی شافعی جارێكیان ئیمامی ئەحمەد بە محمدی كوڕی ئیمامی شافعی فەرموو : باوكت یەكێكە لەو شەش كەسەی كە هەموو سبەینانی دوعایان بۆ دەكەم[٤٠]. وەدەیفەرموو : پێنج كەس لە پاش هەموو نوێژێك دوعایان بۆ دەكەم یەكێكیان (ئیمامی شافعی) یە[٤١] .وە كاتێ باسی ئەو فەرموودەیە بكرایە كە دەڵێت : ((**إن الله يبعث لهذه الأمة على رأس كل مائة سنة من يجدد لها أمر دينها**)) ئیمامی ئەحمەد دەیفەرموو : (عمر بن عبد العزیز) لە سەدەی یەكەم بووە و (ئیمامی شافعی) لە سەر سەدەی دووەم بوو.[٤٢]

ئیمامی ئەحمەد زۆر شتی لە (ئیمامی شافعی) یەوە وەرگرد وەك (ئەنسابی قورەیش) و (فیقه) ،كاتێ ئیمامی ئەحمەد وەفاتی كرد هەردوو نامەكەی (ئیمامی شافعی) لەو شتانە بوو كە جێی هێشتبوو .[٤٣]

(ئیمامی شافعی) دەڵێ : ئیمامی ئەحمەد پێشەوایە لە هەشت رەوشتدا، پێشەوایە لە فەرموودە و فیقه و زمانەوانی و قورئان و هەژاری و زوهد و وەرع و سوننەت دا [٤٤]

جارێكیان (ئیمامی شافعی) دەچێت بۆ لای ئیمامی ئەحمەد دەڵێ : ئەی باوكی عبد الله ئەمڕۆ لە گەڵ چەند كەسێكی خەڵكی عێراقدا بووم لە فلان مەسەلەدا گفت و گۆمان دەكرد خۆزگە فەرموودەیەكی پێغەمبەرم پێ بوایە(ﷺ)؟ ئیمامی ئەحمەد سێ فەرموودەی لەو بابەتە پێ گوت .

(ئیمامی شافعی) فەرمووی : خوا پاداشتی خێرت بداتەوە[٤٥].

---

[٤٠] المناقب :(٢٨٦)، سير اعلام النبلاء :( ٤٨٥/٧) .

[٤١] المناقب :( ٢٨٦) .

[٤٢] البداية والنهاية: (٢٥٣/١٠) ، ابن حنبل:( ٩٧) .

[٤٣] البداية والنهاية :(١٠:٢٧٤) .

[٤٤] الطبقات:( ٥) .

[٤٥] الطبقات :(٦) .

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت :–هەر مەسەلەیەك بەڵگەم لە سەری نەبێت ئەوا من قسە و بۆچوونەکەی (ئیمامی شافعی) دەکەم *.

ئیمامی شافعی دەڵێت : لە بەغدا دەرچووم کەسم تیادا بە جێ نەهێشت لە خواترستر و زاناترو فەقیهـ ترو باشتر بێت لە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل .[٤٦] وە دەڵێت : کەسم نەبینیوە لە(ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) و(سلیمان ی کوڕی داود الهاشمی) عاقڵ تربێت[٤٧].وە دەڵێت : سێ زانا هەن لە سەر سوڕهێنەرەکانی ئەم سەردەمەن یەکێکیان عەرەبێکە یەك وشە (تعریب)ناکات ئەویش (ابو ثور)ە وئەعجەمییەك یەك وشە هەڵە ناکات ئەویش (الحسن الزعفرانـي)ـە وە بچۆکێك ئەگەر قسە بکات ئەوا گەورەکان باوەڕی پێ دەکەن ئەویش (ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)ـە[٤٨]. وە ئەگەر لە هەر شوێنێکدا (ئیمامی شافعی) بڵێت : (حدثني ثقة )ئەوا مەبەستی ئیمامی ئەحمەدە[٤٩].

اسحاق بن راهویە دەفەرمووێت :– جارێکیان ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پێی فەرمووم :– وەرە تاکو کەسێکت پیشان بدەم کە هیچ کەسێك وەکو ئەوی نەبینیوە ، ئەمجار منی برد بۆ لای شافعی .

اسحاق دەفەرمووێت :– ئیمامی شافعی کەسی نەبینیوە وەکو ئەحمەدی کوڕی حەنبەل *.

جارێکیان (ئیمامی ئەحمەد) و (ئیمامی شافعی) و (یحیی ی کوڕی مەعین) پێکەوە چوون بۆ مەککە کاتێ گەیشتنە ئەوێ لە جێگایەکدا لایان دا (ئیمامی

---

* طبقات الشافعية : ( ٥٦/٢ ) .

[٤٦] البداية والنهاية:( ١٠:٢٨١ )،الطبقات:( ١٨ ) ،مناقب:( ١٠٧ ) ،ابن حنبل:( ٨٠ ) ،مباحث في تـدوين السـنة المطهـرة ( ١٩٣ )، الحديث والمحدثون:( ٣٥١ )،تاريخ بغداد: ( ٤ :٤١٩ ) ، سير اعلام النبلاء :(٤٦٥/٧) .

[٤٧] المناقب:( ١٠٨ ) ،ابن حنبل:( ٨٠ ) ، سير اعلام النبلاء:( ٤٦٥/٧ ) .

[٤٨] المناقب:( ١٠٧ )،ابن حنبل:( ٨٠ ) .

[٤٩] المناقب:( ٨٤ ) ، سير اعلام النبلاء : (٤٥٧/٧) .

* سير اعلام النبلاء(٤٦٦/٧).

شافعى) و (يحيى) راكشان بەلاَم( ئيمامى ئەحمەد) نوێژى كرد سبەينى كە هەستان (ئيمامى شافعى) فەرمووى :ئەمشەو دوو سەد مەسەلەى موسڵمانانم شيكار (حل) كرد. (يحيى) فەرمووى : دوو سەد فەرموودە كە بە زمانى پێغەمبەرەوە(ﷺ) دانرابوو بە درۆم خستەوە ، (ئيمامى ئەحمەد)يش فەرمووى : چەند ركاتێك نوێژم كرد هەموو قورئانم تيادا خوێندەوە .[٥٠]

ئيمامى شافعى دەڵێت : چووم بۆ لاى خەليفەى موسڵمانان ( الأمين)([٥١] پاش گفت و گۆ پێم گوت : كاتىَ يەمەنم بە جىَ هێشت حاڵيان باش نەبوو پێويستيان بە حاكمێك هەيە . (الأمين) فەرمووى: يەكێك لەوانەى كە دێن بۆلات و خۆت بە باشى دەزانى بينێرە بۆ لام تاكو بيكەين بە حاكمى يەمەن ، كاتىَ ئيمامى شافعى گەڕايەوە مەجليسەكەى خۆى و ئيمامى ئەحمەدى بينى فەرمووى : لە گەڵ (الأمين )دا قسەم كردووە كە حاكمێك بۆ يەمەن دابنىَ ئەويش فەرمانى پىَ كردم كە يەكێك هەڵبژێرم لەوانەى كە دێن بۆ لام منيش تۆم هەڵبژاردووە تۆيش خۆت ئامادە بكە تاكو بچين بۆ لاى (الأمين) و بتكات بە حاكمى يەمەن ، ئيمامى ئەحمەد زۆر پێى ناخۆش بوو فەرمووى : من دێم بۆ لات بۆ ئەوەى عيلمت لىَ وەرگرم كەچى تۆ داوام لىَ دەكەيت ببم بە قازى ئەگەر ئەم قسەيە ببيسم جارێكى دى ئەوا ئيتر نامبينى ،بۆيە ئيمامى شافعى زۆر شەرمى كرد[٥٢].

## رێزى زانايان لاى ئيمامى ئەحمەد

ئيمامى ئەحمەد زۆر رێزى لە مامۆستاكانى دەگرد جارى وا بوو لە بەر دەستى مامۆستاكانيدا رادەوەستا و شەرمى دەكرد دابنێشى بۆ نموونە ،( قتيبة بن سعيد) دەڵىَ : هاتم بۆ بەغدا هيچ مەبەستێكم نەبوو تەنها بينينى ئيمامى

---

[٥٠] المناقب:( ٢٨٧).

[٥١] دەڵێن هارون الرشيد بووە بەلاَم ئەوەى سەرەوە راستترە والله اعلم.

[٥٢] البداية والنهاية:( ٢٧٥:١٠)،ابن حنبل:( ٧٥)،المناقب:( ٢٧)،سير أعلام النبلاء :(٤٨٢/٧-٤٨٣) .

(٥٣) المناقب :(٥٧) .

ئەحمەد نەبێ بەڵام ئیمامی ئەحمەد هات بۆ لام لە گەڵ (يحيى بن معين) دا دەستمان کرد بە باس کردنی چەند بوارێکی زانستی ئەمجار ئیمامی ئەحمەد هەستاو لە بەر دەستمدا دانیشت فەرمووی : ئەوەی کە فەرمووت دووبارەی بکەرەوە تاکو بینوسم منیش دووبارەم کردەوە دیسان دەستمان کرد بە باس کردنی هەندێ مەسەلەی دی دیسان هەستاو لە بەر دەستمدا دانیشت ، ووتم : ئەی باوکی عبدالله لە جێگەی خۆت دانیشە فەرمووی: بە منەوە خۆت خەریك مەکە دەمەوێت زانست لە رووەوە وەربگرم [٥٣] وەئەگەر باسی (يحيى بن يحيى) بکرایە ئیمامی ئەحمەد دەیفەرموو : یحیى پێشەوا بوو ئەگەر پارەی رێگەکەم بوایە دەرۆیشتم بۆ لای [٥٤] (اسحاق الشهيد) دەڵێ : (ابن يحيى القطان)م دەبینی نوێژی عەسری دەکرد ئەمجار پشتی دەدایەوە بە دنگەی مزگەوتەکەوە (علي بن المديني ) و ( الشاذكوني ) و(عمرو بن علي ) و( احمد بن حنبل ) و ( يحيى بن معين) ...هتد لە بەر دەستیدا بە پێوە رادەوەستان و گوێیان لە فەرموودە دەگرد تاکو نوێژی مەغریب و کەسیان دانەدەنیشتن لە هەیبەت و مەزنی ماٶستاکەیاندا[٥٥].هەروەها (حلف) دەڵێت : ئیمامی ئەحمەد هات بۆ لام بۆ ئەوەی فەرموودەکانی (ابي عوانة) ببیسێ ویستم لە ژوورەوەی خۆمی دابنێم و خۆم لە خوارەوە دانیشم بەڵام ئیمامی ئەحمەد رازی نەبوو و فەرمووی: دانانیشم لەبەر دەستتدا نەبێت چونکە فەرمانمان پێ کراوە خۆمان زۆر بە بچووك بزانین بەرانبەر ئەوانەی کە لێیانەوە فێر دەبین .[٥٦]

وە لە ساڵی ٢١٣ داوایان لە ئیمامی ئەحمەد کرد بۆ گێڕانەوەی فەرموودە ئەویش فەرمووی: گوێ لە من دەگرن و کەسانی وەك (ابو عاصم) زیندوون ، بڕۆن بۆ

---

[٥٤] المناقب :(٢٩)، ابن حنبل:( ٣٢) .

[٥٥] المناقب:( ٥٧) .

[٥٦] المناقب :(٥٨) .

لاى ئەو[٥٧].جارێكيان (ابو زرعة) هات بۆلاى ئيمامى ئەحمەد رۆژێك مايەوە پاشان ئيمامى ئەحمەد فەرمووى : ئەمڕۆ لە نوێژى فەرز زياتر هيچ نوێژێكى سوننەتم نەكردووە چونكە گفتو گۆ كردن لە گەڵ ( ابو زرعة) دا دەربارەى زانست و زانيارى لە نوێژى سوننەت پێم خۆشترە[٥٨].و(ابو زرعة) يش دەڵێت: ئيمامى ئەحمەد هەزار هەزار فەرموودەى لەبەر بووە* .

جارێكيان ئيمامى ئەحمەد بە( يحيى بن معين) دەڵێت : مەڵێ ( حدثنا اسماعيل بن علية ) بەڵكو بڵێ (حدثنا اسماعيل بن ابراهيم ) چونكە اسماعيل پێى ناخۆش بووە بە ناو دايكييەوە بانگى بكەن ، بۆيە يحيى لە وەڵامدا فەرمووى : ئەوا لە تۆمان وەرگرد ئەى مامۆستاى خەير[٥٩] .هەروەها ئيمامى ئەحمەد دەڵێت : لە ناو دڵمدا كەس پێش (سفيان الثوري) ناكەوێ وە سفيان پێشەوايە[٦٠]

## تێگەيشتنى ئيمامى ئەحمەد

ئيمامى ئەحمەد زۆر شارەزا بوو لە ماناو مەبەستى فەرموودەكانى پێغەمبەر (ﷺ) واى لێ كردبوو كە ئيمامى ئەحمەد ببێتە يەكێك لەو چوار پێشەوا فيقهيە كە تاكو ئێستا زۆربەى خەڵكى لە سەرى دەڕۆن وە نوسينەكانى شاهيدى ئەم قسانەن و تاكو ئێستا بۆچوونەكانى دەخوێنرێت و بووەتە مامۆستايەك بۆ خەڵكى ئەوەتا( اسحاق بن راهويه) دەڵێت : لە عێراق دادەنيشتم لە گەڵ ئيمامى ئەحمەد و يحيى بن معين و هاوەڵانى تردا باسى فەرموودەيەكمان دەكرد لە رێگايەكەوە يا دوو رێگا يا سێ رێگاوە يحيى دەيفەرموو : لە فلان

---

[٥٧] المناقب:( ١٨٩) .

[٥٨] المناقب:( ٢٨٩) ، سير أعلام النبلاء : ( ٧/٤٨٥) .

* سير أعلام النبلاء : ( ٧/٤٦٠) ، تاريخ بغداد : ( ٤/٤١٩) ، طبقات الشافعية : ( ٢/٥٧) .

[٥٩] المناقب:( ٢٦٧) .

[٦٠] ابن حنبل :(١٠٢) .

ڕێگایشەوە ئەم فەرموودەیە بە ئیجماع دروست(صحيح) ە ؟ دەیانفەرموو : بەڵێ . منیش دەمگوت : باشە ، مەبەستی چییە ؟ مانای چییە؟ فیقهی چییە ؟ هەموو بێ دەنگ دەبوون تەنها ئیمامی ئەحمەد نەبێ وەڵامی دەدایەوە[٦١] .

وە ئەگەر باسی فیقه بکرایە( ابو عاصم) دەیفەرموو :لە بەغدادا کەس وەك ئەو پیاوە نییە (واتە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)[٦٢] بۆیە (حبيش بن مبشر) دەڵێ : ئێمە تێڕوانینمان دەکرد (مناظرة) و ڕەخنەمان لە خەڵکی دەگرد ئەگەر ئیمامی ئەحمەد بهاتایە هەمومان بێ دەنگ دەبوین[٦٣] .

وە هەروەها ئیمامی ئەحمەد زمانی فارسی دەزانی و دەیتوانی قسە بەو زمانە بکات* .

## چەند نمونەیەك لە فیقهی ئیمامی ئەحمەد

هەر وەکو باسمان کرد کە ئیمامی ئەحمەد زۆر شارەزای مەبەست و فیقهی فەرموودە بووە لێرەدا چەند نمونەیەك دەهێنینەوە لەو بوارە فیقهیانەی کە ئیجتهادی تیادا کردووە :

پرسیار کرا لە ئیمامی ئەحمەد : ئەگەر موسڵمانێك بە کابرایەکی (نصراني) گوت : خوا ڕێزدارت بکات ، ئایە دەبێ؟ ئەویش فەرمووی : بەڵێ مەبەستی ڕێزدارت بکات بە ئیسلام** .

وە پرسیاری لێ کرا : کابرایەك سوێندی خوارد بە سێ (طلاق) کە ئەمشەو دەچێتە لای خێزانییەوە بەڵام بۆی دەرکەوت خێزانی لە بێ نوێژی دایە

---

[٦١] المناقب:( ٦٣)،ابن حنبل:( ٨٣) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦١/٧) ، تاريخ بغداد : ( ٤١٩/٤) .
[٦٢] المناقب:( ٦٣) ، تاريخ بغداد : ( ٤١٩/٤) .
[٦٣] المناقب:( ٦٤) .
* سير أعلام النبلاء : ( ٤٧٩/٧) ، ابن حنبل : (٣١) .
** سير أعلام النبلاء : ( ٥٣٥/٧) .

ئایە چی بکات ؟ ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: تەڵاقی دەکەوێت وناچێتە لایەوە چونکە خوای گەورە تەڵاقی حەڵاڵ کردووە بەڵام چوونە لای ئافرەت کە لە بێ نوێژیدا بێت حەرامی کردووە .[٦٤]

وە پرسیاری لێ کرا : کابرایەك نزری کردووە کە لە سەر چوار (طواف) بکات بە دەوری کەعبەدا ( واتەلە سەر هەردوو دەست و هەردوو پێی ) ؟ فەرمووی:_ دوو طواف بکات و لە سەر چوار طواف نەکات . تەماشای ئەم فیقهە بکەن بینی کە مرۆڤ لە سەر چوار وەك ئاژەڵی لێ دێت و جوان نییە بۆ مرۆڤ و بۆ کەعبەیش، بۆیە هەردووکی پاراست و نەیهێشت سوێندەکەی بکەوێت چونکە دوو جار طواف دەکاتە چوار[***] .

وە پرسیاری لێ کرا دەربارەی خوێندنەوەی قورئان بە ئاوازەوە (ألـحان) ؟ فەرمووی : بیدعەیە[****] .

(إسحاق بن هانـیء) دەڵێ : لە ماڵ ئیمامی ئەحمەد دانیشتبوین (المروزي) و (مهنـی بن یحیی) لەوێ بوون یەکێك دای لە دەرگا و فەرمووی : المروزی لێرەیە ؟ (المروزی پێی ناخۆش بوو کە ئەو کابرایە جێگەی بزانێت) بۆیە( مهنـی بن یحیی) پەنجەی خستەسەر سکی خۆی و فەرمووی : (المروزی) لێرە نییە (المروزی) لێرە چی دەکات ؟ ئیمامی ئەحمەد پێکەنی و ئینکاری لێ نەکرد.[٦٥]

## ئیمامی ئەحمەد و سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

ئیمامی ئەحمەد هەردەم دەستی بە سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) گردبوو وە زۆر لەوە بە ناو بانگ ترە کە لێرەدا باسی شوێنکەوتنی ئیمامی

---

[٦٤] المناقب:( ٦٤) .

[***] سير أعلام النبلاء : ( ٥٣٦/٧) .

[****] سير أعلام النبلاء : ( ٤٧٨/٧) .

[٦٥] المناقب:( ٢٢١) ، سير أعلام النبلاء : ( ٥٣٥/٧) .

ئەحمەد بۆ سوننەتەکان بکەین بەڵام چەند نمونەیەك دەهێنینەوە چونکە دەڵێن مشتێك نموونەی خەرواریکە .

دەڵێن جارێك ئیمامی ئەحمەد جاریەیەکی کڕی ناوی لێ نا( ریحانة) وەك شوێن کەوتنێکی پێغەمبەر(ﷺ).[٦٦]

وە ئەگەر پرسیاری لێ بکرایە دەربارەی هەر شتێکی تازە دەیفەرموو : هاوەڵان و شوێن کەوتووان قسەیان دەرباری کردووە .؟[٦٧] وە هێندە ئەهلی سوننەی خۆش دەویست تەنانەت دەڵێن جارێك فەرموویان : ئەی باوکی عبد الله لە مەککە باسی (**أصحاب الحديث**) یان بۆ (ابی قبیله) کردووە گوتویەتی : میلەتێکی خراپن (قوم سوء) ، ئیمامی ئەحمەد هەستایە سەر پێ و جلوبەرگەکەی خۆی تەکاند وفەرمووی : زنديق زنديق زنديق تاکو چووەماڵەوە .[٦٨]

ئیمامی ئەحمەد دەڵێ : کێ رێز لە( **أصحاب الحديث** ) بگرێ رێزدار دەبێ لای پێغەمبەر (ﷺ) و کێ بێ رێز تەماشایان بکات بێ رێز دەبێ لای پیغەمبەر (ﷺ) چونکە (**أصحاب الحديث**) زاناو (احبار)ی پێغەمبەرن(ﷺ) .[٦٩]

(عبد الملك الميموني) دەڵێ : چاوەکانم لە (ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)ی باشتر نەبینیوە وە کەسم نەبینیوە لە فەرموودەناسان زۆر رێز لە (حُرُمات)ی خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بگرێ وەك ئیمامی ئەحمەد وە ئەگەر فەرموودەیەکی دروست (صحيح) بوایە کەس نەبوو وەك ئیمامی ئەحمەد شوێن کەتووی بێت .

---

[٦٦] المناقب:( ١٧٧) .

[٦٧] المناقب:( ١٧٩) .

[٦٨] طبقات:( ٣٨)،المناقب:(١٨٠) ، سير أعلام النبلاء : (٥٢٤/٧) .

[٦٩] المناقب:( ١٨٠) .

وە هێندە فەرموودە ناسانی خۆش دەویست تەنانەت دەڵێن جارێکیان پرسیار کرا لە ئیمامی ئەحمەد فەرموویان : ئەی باوکی عبدالله کەسێك فەرموودە دەنووسێت و کەسێك نوێژ و ڕۆژووی سوننەت دەکات، کامیان باشترە؟فەرمووی : فەرموودە بنووسیّ .فەرموویان: چۆن فەزڵی نوسینی فەرموودە دەدەی بە سەر نوێژ و ڕۆژوودا ؟فەرمووی : لە بەر ئەوە کەس نەڵیّ خەڵکانێکمان بینی لە سەر شتێك بوون و ئێمەیش شوێنیان کەوتین .[٧٠]

وەدەیفەرموو : ئەگەر کەسێك فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) ڕەت بکاتەوە ئەوا لە لێواری هەلاکەتدایە[٧١] .(عبد الرحمن الطیب) دەڵێت :(ئیمامی ئەحمەد) و( بشر بن الحارث الحافي) نەخۆش کەوتن دەچووم سەرم لێیان دەدا کاتیّ دەچوومە ژوورەوە بۆ لای بشر دەمگوت : چۆنی ؟ دەیفەرموو : سوپاس بۆ خوا ئەمجار باسی حاڵی خۆی بۆ دەکردم . وە دەچووم بۆ لای ئیمامی ئەحمەد و هەواڵی حاڵی ئەوم دەپرسی دەیفەرموو: باشم . ڕۆژێکیان بە ئیمامی ئەحمەدم گوت : بشر نەخۆشە کاتیّ هەواڵی دەپرسم دەڵیّ : سوپاس بۆ خوا ئەمجار باسی حاڵی خۆی دەکات . ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : پرسیاری لیّ بکە بزانە لە کیّ وە وەریگردووە ؟ ووتم : شەرم دەکەم . ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : بڵیّ ئیمامی ئەحمەد پرسیاری کردووە . عبد الرحمن دەڵیّ : چووم بۆ لای بشر و پێم گوت ، بشر لە وەڵامدا فەرمووی : ئیمامی ئەحمەد هیچ شتێك وەرناگرێت بە سەنەدەوە نەبێت ( عن ابن عون عن ابن سیرین ) دەڵیّ : ئەگەر کەسێك پێش سکاڵاکەی سوپاسی خوای کرد ئەوا بە سکاڵا ناژمێردرێت .کاتیّ پێت دەڵێم حاڵم وایە دەزانم دەسەڵات و توانای خوا بە سەرمەوەیە .عبد الرحمن دەڵیّ : چووم بە ئیمامی ئەحمەد م گوت . پاشان ئەگەر سەردانی ئیمامی ئەحمەدم بکردایە و

---

[٧٠] المناقب:( ١٨٢) .

[٧١] المناقب:( ١٨٢)،ابن حنبل:( ٩٠) ، سیر أعلام النبلاء :( ٥٢٣/٧) .

پرسیاری حاڵی ئەوم بکردایە دەیفەرموو : سوپاس بۆ خوا پاشان باسی حاڵی خۆی بۆ دەکردم .[٧٢] پێشەوا بە هەموو کەسێك نەیدەفەرموو( **أصحاب الحديث**) هەرچەندە فەرموودەی بنووسایە بەڵکو تەماشای کردەوەکان و رادەی شوێنکەوتنی کەسەکە بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)دەکرد ، (ابو القاسم منيع) دەڵێ : ویستم بڕۆم بۆ لای (سويد بن سعيد) بە مەبەستی وەرگرتنی فەرموودە بە ئیمامی ئەحمەدم گوت کە نامەیەکم بۆ بنووسێ ئەویش نوسی : ئەم کابرایە فەرموودە دەنووسێ . پێم گوت : ئەی باوکی عبد الله پێم خۆشە بنووسی ئەم کابرایە (**أصحاب الحديث** ) ە . ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : (**أصحاب الحديث**) لای ئێمە ئەو کەسەیە کە کار بە فەرموودەکان دەکات .[٧٣]

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : **هیچ** فەرموودەیەکم نەنوسیوە و کارم پێ نەکردبێ، تەنانەت جارێکیان فەرموودەیەکم بینی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەڵە شاخی کردووە ( احتجم ) و بە کابرا یەك دیناری داوە منیش کاتێ کەڵە شاخم کرد دێنارێکم دا بە کابرا .[٧٤]

ئیمامی ئەحمەد لە ژیانیدا پێنج جار حەجی کردووە و سێ لەم حەجانە بە پێ بووە یەکەمیان ساڵی ١٨٧ بووە، وە لە یەکێك لەو حەجانە تەنها سی دەرهەمی خەرج کردووە وە دەڵێ جاری وابوو رێگام لێ بزر دەبوو منیش لە بەر خۆمەوە دەمگوت ئەی بەندەکانی خوا رێگام پیشان بدەن کاتێکم دەزانی وام لە سەر رێگا* .

---

[٧٢] المناقب:( ١٧٨-١٧٩) .

[٧٣] المناقب:( ٢٠٧) .

[٧٤] المناقب:( ١٧٩) ،ابن حنبل:( ٣٣،٩٠) ،سير أعلام النبلاء : (٤٧٦/٧) .

* سير أعلام النبلاء : ( ٤٥٨/٧) ، البداية والنهاية : ( ٢٧٣/١٠) ، ابن حنبل : ( ٢٤) .

ئیمامی ئەحمەد دەیفەرموو : بۆچوونەکانی من مەنووسن رەنگە ئێستا شتێك بڵێم و سبەینی لێی پەشیمان ببمەوە .[٧٥]

وە دەیفەرموو : قسەکانی (مالك) و(سفيان) و(الشافعي) و(اسحاق بن راهويه) و(أبي عبيد) مەنووسن بەڵکو لە سەرتانە لە(أصل)ەوە شت وەرگرن [٧٦].

لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە ئیمامی ئەحمەد زۆر رقی لە بۆچوون (رأي) بووە.

وەجارێکیان کابرایەك پرسیاری کرد لە ئیمامی ئەحمەد ئایە کتێبەکانی (رأى) بنووسم .فەرمووی: نەخێر .فەرمووی: ئەی (ابن مبارك) دەینوسیّ فەرمووی: ابن مبارك لە ئاسمانەوە دانەبەزیوە بەڵکو فەرمانمان پیّ کراوە کە لە سەرەوە عیلم وەرگرین[٧٧].وە لە جێگایەکی تردا ئیمامی ئەحمەد دەڵیّ : پێم گەیشتووە کە (إسحاق الكوسج) لە خوراسان چەند بۆچوونێك لە بۆچوونەکانی منی نوسیوەو بڵاوی دەکاتەوە ئێوە شایەت بن کە من لە هەموو ئەو بۆچوونانە گەڕاومەتەوە [٧٨]

(أبو بكر المروزي) دەڵیّ : کابرایەکی خەڵکی خوراسان هات بۆ لای ئیمامی ئەحمەد کتێبێکی دا بە دەستییەوە ئیمامی ئەحمەد تەماشای کرد و بینی وا چەند قسەیەکی خۆی (واتە: ئیمامی ئەحمەد) تیادایە ، بۆیە ئیمامی ئەحمەد پەست بوو و کتێبەکەی فڕیّ دا [٧٩] .

هەروەکو باسمان کرد کە ئیمامی ئەحمەد زۆر رقی لە ئەهلی بیدعە بووە، جارێکیان( أبو داود السجستاني) پرسیاری لیّ کرد وفەرمووی :ئەگەر

---

[٧٥] الطبقات:( ٣٩)، ابن حنبل:(١٦٩) .
[٧٦] الطبقات:( ٥٧)،المناقب:( ١٩٢) ،ابن حنبل:( ٣٩،١٥٦) .
[٧٧] ابن حنبل:( ٣٩) ،المناقب:( ١٩٣) .
[٧٨] المناقب:( ١٩٤) ،ابن حنبل:( ٣٩،١٥٦) .
[٧٩] المناقب:( ١٩٤) ،ابن حنبل:( ٣٩) .

کەسێکی ئەهلی سوننەم بینی لە گەڵ کەسێکی ئەهلی بیدعەدا ئایە وازی لێ بهێنم و لە گەڵیدا قسە نەکەم ؟ فەرمووی: نەخێر تاکو پێی نەڵێیت ئەو کەسەی کە هاوەڵتە خاوەن بیدعەیەو ئەهلی بیدعەیە ئەگەر وازی لێ هێنا ئەوا باشە وە ئەگەر وازی لێ نەهێنا ئەویش وەکو ئەوەو قسەی لە گەڵ دا مەکە[٨٠].

وە هەروەها ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : هیچ سەردەمێك نازانم خەڵکی زیاتر پێویستیان بە داوا کردنی فەرموودە بێت وەك ئەم سەردەمە . فەرموویان : بۆ ؟ فەرمووی: چونکە بیدعە پەیدا بووە ئەگەر کەسێك فەرموودەی پێ نەبێ ئەوا دەکەوێتە ناو بیدعەوە .[٨١]

وە دەڵێ : ئەهلی بیدعەو ئارەزوو پەرستان نابێ پەنایان پێ بگیردرێت لە هیچ شتێك لە کار و باری موسڵمانان دا چونکە گەورەترین زیانیان هەیە بۆ دین[٨٢]. وەجارێکیان( الحزامی )هات بۆ لای ئیمامی ئەحمەد بەڵام پێش ئەوە چوو بوو بۆ لای( ابن ابي دؤاد) کاتێ ئیمامی ئەحمەد( الحزامی) بینی دەرگای لە سەر داخست و چووە ژوورەوە [٨٣]

وەهەروەها (الحارث المحاسبي) دەربارەی عیلمی کەلام قسەی دەکرد بۆیە ئیمامی ئەحمەد وازی لێ هێناو رووی پێ نەدا و هەجری کرد ئەویش ناچار بوو لەماڵێکدا لە بەغدا خۆی شاردەوە و تاکو مرد وەکاتێك مرد تەنها چوار کەس نوێژیان لە سەر کرد * .

---

[٨٠] المناقب:( ١٨٣) .
[٨١] المناقب:( ١٨٣) .
[٨٢] المناقب :(١٨٤) .
[٨٣] المناقب:( ١٨٢) .
* سير أعلام النبلاء : ( ٥٣٩/٧) .

## ئیمامی ئەحمەد و عیزەتی نەفس :

ئیمامی ئەحمەد هێندە عیزەتی نەفسی بەرز بوو کە وای لێ کردبوو لە ڕەوشتیدا ڕەنگ بداتەوە قوتابی‌یەکانی لەوەوە فێربوون کە شوێن کەوتەی ئەو بن ، ( ابن الجروی) کە ئیمامی ئەحمەد زۆر ڕێزی لێ دەگرد دەڵێت : چووم بۆ لای ئیمامی ئەحمەد و هەزار دینارم پێدا بۆ ئەوەی پێویستییەکانی خۆی و منداڵەکانی پێ جێ بە جێ بکات ئیمامی ئەحمەد ڕازی نەبوو، پێی فەرمووم : پێم خۆشە ئیتر نەیەیت بۆ لام وە ئەگەر پێویستیت بوو یان پرسیارێکت بوو ئەوە نامەیەکم بۆ بنێرە[٨٤]

وە دەڵێن گەنجێك بوو دەهات بۆ لای ئیمامی ئەحمەد و هاتووچۆی دەکرد ڕۆژێکیان ئیمامی ئەحمەد دوو دەرهەمی دا بە گەنجەکە وفەرمووی: چەند پەڕە کاغەزێکم بۆ بکڕە ، ئەویش چوو بۆی کڕی و پێنج سەد دیناری کردە ناو کاغەزەکەوە و توند بەستی و گەیاندی‌یە ماڵی ئیمامی ئەحمەد کاتێ درا بە دەستی ئیمامی ئەحمەد و ئەویش کردی‌یەوە هەموو پارەکە پەرت و بڵاو بووەوە ئیمامی ئەحمەد گەڕانی‌یەوە جێگەی خۆی و پرسیاری گەنجەکەی کرد تاکو ماڵیانی دۆزی‌یەوە چوو بۆ لای و هەموو پارەکەو کاغەزەکەی گەڕانەوە ، گەنجەکە شوێن ئیمامی ئەحمەد کەوت وفەرمووی : کاغەزەکان بە پارەی خۆت کڕیومە بیبە ، بەڵام ئیمامی ئەحمەد ئەویشی وەرنەگەرد[٨٥] .

وە هەرچەندە پێویستی بە پارە بوایە هەرگیز داوای لە خەڵکی نەدەکرد و قەرزی لە کەس وەرنەدەگرد وا ڕێك کەوت جارێکیان چوو بۆ لای (یزید بن هارون) لە گەڵ چەند قوتابییەکی تردا لە (واسط) هەموویان پێویستیان بە پارە

---

[٨٤] المناقب:( ٢٣٥) .

[٨٥] المناقب ٢٣٨ .

بوو و هەموو قەرزیان کرد تەنها ئیمامی ئەحمەد نەبێ که رۆیشت جبەکەی خۆی فرۆشت ( هەرچەندە زۆر ساردیش بوو )[٨٦] .

وەجارێکیان کابرایەك هەزار دیناری دا بە ئیمامی ئەحمەد کەچی ئەو وەری نەگرد* .

وە دەیان جاری تر خەڵکی پارەیان دەدا بە ئیمامی ئەحمەد کەچی ئەو وەری نەدەگرد .

## بژێوی ژیانی ئیمامی ئەحمەد

لە گەڵ ئەو هەموو هەژاری و بێ دەستییەدا ئیمامی ئەحمەد هەر بە شوێن زانست و زانیاری دا دەگەڕا زۆر شار و وڵاتی دیوە و زۆر بایەخی دەدا بە ماڵی حەڵاڵ و هەرچەندە هەژاری بێ تاقەتی بکردایە ئەوا زیاتر لە ماڵی حەرام دوور دەکەوتەوە.

کاتێ باوکی ئیمامی ئەحمەد کۆچی دوایی کرد هیچ شتێکی بۆ بە جێ نەهێشت جگە لە خانویەك نەبێ کە تیایدا دەژیاو کرێ یەك (عەقار) کە بە کرێکەی دەژیا کە ١٧ دەرهەم بوو[٨٧] .وە زۆر جار کرێکاری دەکرد و زۆر جاریش بە کرێ شتی بۆ خەڵکی دەنووسی و یان جلوبەرگی دەکرد و دەیفرۆشت** بە گشتی دەتوانین بڵێین کە ئیمامی ئەحمەد لە سێ ڕێگاوە پارەی دەست دەکەوت بۆ چەرخاندنی رەوڕەوەی ژیانی ئەویش [٨٨]: –

١_ کۆکردنەوەی پاشماوەی کشتو کاڵییەکان لە زەوێکاندا پاش پرس پێ کردنی خاوەنەکەی .

---

[٨٦] المناقب :( ٣١ ، ٢٢٨– ٢٢٩ ) .

* سير أعلام النبلاء : ( ٤٧٠/٧) ، المناقب : ( ٢٣٤) .

[٨٧] ابن حنبل:( ٧١) .

** المناقب :( ٢٢٦) .

[٨٨] ابن حنبل:( ٧١ –٧٣ )،الائمة الاربعة:( ١٥٩ )،المناقب:( ٢٢٤ )،سير أعلام النبلاء : ( ٥٣٥/٧) .

٢-یاخود کرێکاری دەکرد و شتی دەنووسی وشتی دەچنی بە کرێ.

٣-جاری وا هەبوو قەرزی دەکرد ( ئەویش لە هەموو کەسێك و جیگایەك نا)

دەڵێن جاریَ لە کابرایەك قەرزی کردبوو پاش ماوەیەك قەرزەکەی بۆ گەڕاندەوە کابرا فەرمووی: من پارەم پێت نەدا بۆ ئەوەی لێت وەرگرمەوە ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: منیش پارەم لێت وەرنەگرد بۆ ئەوەی بۆت نەگێڕمەوە* .

وە ئەگەر ماڵێك بچووکترین گومانی تیادابوایە ئەوا نەیدەخوارد و هەرگیز دیاری یا شتێکیان پیَ بدایە وەری نەدەگرد.[٨٩]

وەدەڵیَ: دایکم بە منداڵی گوێی کون کردم و دوو( لؤلؤ )ەی تیَ کرد کاتیَ گەورە بووم فرۆشتم بە سی دەرهەم .[٩٠]

## ئەو پاڵنەرانەی کە بووە هۆی ئەوەی ئیمامی ئەحمەد ببێتە ئەو زانایە[٩١]

جاری واهەیە پاڵنەرێك یان ڕووداوێك لە ژیانی مرۆڤدا ڕوو دەدات وا لە مرۆڤەکە دەکات کە گۆڕانکارییەك دێنێتە سەر ژیانیدا جا لێرەدا مەبەستمان ئیمامی ئەحمەدە کە چەند هۆکار و پاڵنەرێك بوو وای لە ئیمامی ئەحمەد کرد کە ببێتە ئەو زانا بلیمەتە لەو هۆکارانە :

**یەکەم** : ڕەوشتی : چەند ڕەوشتێك هەبوو ئیمامی ئەحمەد هەردەم دەستی پێوە گردبوو خوای گەورەش یارمەتی دەری بوو یەکێك لەو بەهرانە ئەوە بوو کە ئەگەر هەر فەرموودەیەك یا هەر شتێکی دی بخوێندایە بە زووترین کات لە بەری دەکرد چیتر لە یادی نەدەچوو وە ئەوەی کە دەیخوێندەوە لە بەری

* سير أعلام النبلاء : ( ٤٧٧/٧) .

(٨٩) الائمة الاربعة:( ١٦٠) ،ابن حنبل:( ٧٠ ) .

(٩٠) البداية والنهاية:( ١٠ :٢٧٣ ) ، سير أعلام النبلاء : ( ٤٥٦/٧) .

(٩١) ابن حنبل:( ٨١-١١٥) .

دەکرد و بە جوانترین شێوە و بە زووترین کات لێی تێ دەگەیشت وە ئارامییەکی زۆری هەبوو لە زانست وەرگرتندا ، گوێی نەدەدایە هەر کۆسپ و چەڵەمەیەکی ژیان گەر رووی بدایە و خۆی زۆر دەپاراست و لەتاوان خۆی بە دوور دەگرد وو هەرگیزاو هەرگیز بە قسەی نەفسەکەی خۆی نەدەکرد و زۆر پارێزگاری لە ئیمانەکەی دەکرد چونکە  لەو سەردەمەو لە هەموو سەردەمێکدا پاراستنی ئیمان ئاسان نییە و لەو کاتەدا کە ئەو هەموو (کۆمەڵانە) پەیدا بوون ئیمامی ئەحمەد نەیدەهێشت عەقلْ بەشدار بێت لە مەسائلی ئیماندا بەڵکو تەرازووی ئەو تەنها قورئان و فەرموودە بوو .

**دووەم** : دڵسۆزی(الاخلاص): ئیمامی ئەحمەد لە ژیانیدا زۆر دڵسۆز بوو وەزۆر خۆی لە ریاوە بە دوور دەگرد و هەوڵی دەدا کە لە هەموو کارەکانیدا تەنها مەبەستی خوا بێت و هەیبەت و سامێکی بوو کە مامۆستاو قوتابییەکانی شەرمیان لێ دەکرد .

**سێیەم** :مامۆستاکانی : چەند مامۆستایەك بوون کە زۆر کاریگەریان لە سەر ژیانی ئیمامی ئەحمەد بوو وە بوونە کۆڵەکەیەك بۆی نەك تەنها لە رووی زانستەوە بەڵکو لە رەوشت و زوهد و وەرع و لە خواترسان و...هتد لەو مامۆستایانە ( سفيان الثوري) و( ابن مبارك )بوون هەرچەندە ئیمامی ئەحمەد ئەوانی نەبینیبوو بەڵام کردبوویە پێشەوای خۆی و زۆر سوودی لێیانەوە وەرگرد وە هەروەها(هشيم بن بشير )و ( ئیمامی شافعی) کە ئیمامی ئەحمەد زۆری خۆش دەویستن و سوودێکی زۆر ی لێ وەرگرتن .

**چوارەم** : لێکۆڵینەوە تایبەتییەکانی خۆی : ئیمامی ئەحمەد کاتێ فەرموودەیەکی وەردەگرد وەکو هەندێ لە هاوەڵانی تەنها فەرموودەکەی لە بەر نەدەکرد بەڵکو زیاتر هەوڵی دەدا کە لە فەرموودەکە بگات هۆی وتنی ئەم

فەرموودەيە چى بوو ؟ چەند سوودى فيقهى تێدايە ؟ چەند ئەحكامى تێدايە ؟ .....هتد

**پێنجەم** : سەردەمى ئيمامى ئەحمەد :هەروەكو باسمان كرد لە سەردەمى ئيمامى ئەحمەد دا چەند كۆمەڵێك لە كۆمەڵى ئەهلى سوننەو جەماعە جيا بوونەوە وەك (مرجئة) و (معتزلة) و (جهمية) و (شيعة) ..هتد هەرچەندە لە پێش ئيمامى ئەحمەد هەبوون بەڵام لە سەردەمى ئيمامى ئەحمەد دا زۆر بوون و پەرەيان سەند چونكە زۆر لە كتێبە فەلسەفييەكان وەرگێررانە سەر زمانى عەرەبى و تێكەڵى عەقيدەى موسڵمان بوو كە بووە هۆى لادانى هەندێ لە موسڵمانان لە سەر مەنهەجى ئەهلى سوننەو جەماعە چونكە كاتێ عەقلێ تێكەڵى هەندێ بابەتى ئيمانى دەبێت ئەوا پەنا بە خوا موسڵمان تێدەكەوێت بێ ئەوەى ئاگاى لێى بێت  چونكە موسڵمان دەبێ عەقيدەو ئيمانى خۆى تەنها لەقورئان و فەرموودەوە وەربگرێت .

## كۆڕ و مەجليسى ئيمامى ئەحمەد

لە كاتى وتنەوەى دەرسەكاندا لە مەجليسى ئيمامى ئەحمەد دا چەند دياردەو جياوازييەك هەبوو كە لە كۆڕ و كۆمەڵەكانى تردا بە دى نەدەكرا لە و جياوازييانە:

**يەكەم** : بە هيچ شێوەيەك گاڵتەو پێكەنين و قسەى بێ سوود نەدەكرا چونكە باوەڕى وابوو كە گێڕانەوەى فەرموودە عيبادەت و خوا پەرستييە وەلە كاتى عيبادەتدا نابێ گاڵتەو پێكەنين بكرێ .

**دووەم** : تاكو داواى لێ نەكرايە فەرموودەى نەدەگێڕايەوە و ئەگەر داواى لێ بكرايە لە كتێبەوە نەبوايە نەيدەگێڕايەوە هەرچەندە فەرموودەكەى لە

بەر بوایە . وەلەماوەی ئەو چل ساڵەدا کە فەرموودەی تیادا گێڕاوەتەوە ژماردوویانە نزیکەی سەد فەرموودەی بە بێ کتێب گێڕاوەتەوە* .

**سێیەم** : بە گشتی دەرسەکانی ئیمامی ئەحمەد لە دوو بەش پێك هاتبوو یەکەمیان نوسینی فەرمووده بوو کە قوتابییەکان دەياننوسی . وەبەشی دووەم فیقه بوو کە پرسیار دەکرا و ئەویش وەڵامی دەدایەوە و نەیدەهێشت بینووسن(٩٢) .

وە جاری وابوو نزیکەی پێنج هەزار کەس دادەنیشتن لە مەجلیسەکەیدا کەچی تەنها پێنج سەد کەس فەرموودەیان دەنووسی، بەڵام ئەوانی دی دەهاتن بۆ فێر بوونی رەوشت و ئەدەب لە ئیمامی ئەحمەدەوە .(٩٣)

## چەند رەوشتێکی ئیمامی ئەحمەد**

ئیمامی ئەحمەد کابرایەکی زۆر روو خۆش بوو، جلوبەرگێکی سپی لە بەر دەکرد و عەمامەیەکی دەبستە سەرەوە ، کابرایەکی باڵا بەرز بوو، سەری دەگرد لە خنە و خۆی ئەسمەر بوو ، ئەگەر باسی دونیا بکرایە بەشداری نەدەکرد و گەر باسی عیلم و زانیاری بکرایە ئەوا قسەی دەکرد . جلو بەرگەکەی زۆر بە پاکی رادەگرد و زۆر رێزی لە خەڵکی دەگرد بە تایبەت لە مەجلیسەکەی خۆیدا ، حەزی لە قسەی بێ سوود و بێ کەڵك نەبوو تەنها باسی فەرموودە یا باسی زاهیدان و پیاو چاکانی دەکرد، زۆر رێزی لە زانایان دەگرد هەروەها ئەوانیش رێزیان لێ دەگرد، گەر کەسێکی خۆش بویستایە تەنها لە بەر خوا خۆشی دەویست و گەر رقی لە کەسێ بوایە ئەوا لە بەر خوا رقی لێی دەبوو، وەهێندە خەڵکی شەرمی لێ دەکرد تەنانەت( بدوی) دەڵێ : جارێکیان ئیمامی

---

* سير أعلام النبلاء : ( ٤٧٦/٧) .

(٩٢) ابن حنبل:( ٣٦-٤٠) .

(٩٣) المناقب:( ٢١٠) ،ابن حنبل:( ٣٥) ، سير أعلام النبلاء :( ٥٣٣/٧) .

** سير أعلام النبلاء : ( ٤٨٠/٧-٤٨١) .

ئەحمەد منی بینی پێ دەكەنیم بۆیە لەو رۆژ بە دواوە شەرمم لێی دەكرد[٩٤] . وە جاری وابوو خەڵكی دەهاتن بۆ لای نەك تەنها بۆ وەرگردنی فەرموودە بەڵكو بۆ وەرگردنی رەوشت ئەوەتا (ابوبكر المطوعي) دەڵێ : دوازدە ساڵ سەردانی ئیمامی ئەحمەدم دەكرد كە (المسند) ی بۆ كورەكانی دەخوێندەوە كەچی یەك فەرموودەم نەنووسی تەنها تەماشای رەوشت و ئەدەبی ئەوم دەكرد .[٩٥]

(هارون بن عبدالله الـحمال) دەڵێت : شەوێك لە شەوان ئیمامی ئەحمەد سەردانی كردم و فەرمووی : ئەمڕۆ دڵم لای تۆ بوو ، منیش ووتم: لەبەر چی ؟فەرمووی: ئەمڕۆ بە تەنیشتتەوە تێپەڕیم دانیشتبووی فەرموودەت دەگێڕایەوە كەچی خۆت لە سێبەر دانیشتبویت و ئەوانەی كە دەیاننوسی لە بەر هەتاو بوون بۆ جارێكی دی ئەگەر فەرموودەت گێڕایەوە ئەوا لە گەڵ خەڵكەكەدا دانیشە[٩٦]

جارێكیان كابرایەك فەرمووی: ئەی باوكی عبدالله غەیبەتم كردووی گەردنم ئازاد بكە .ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: گەردنت ئازاد بێت گەر دووبارەی نەكەیتەوە. فەرموویان: — گەردنی ئازاد دەكەیت كەچی ئەو غەیبەتی كردووی .؟فەرمووی: ئەی نەتانبینی مەرجم لەسەر دانا[٩٧] .

ئیمامی ئەحمەد لە وتەو كردەوەكانیدا زۆر دڵسۆز بوو كە لە ژیانیدا رەنگی دابووەوە ، ئەگەر كەسێكی ببینیایە( محبرە) ی بە دەستەوە بوایە بۆ ئەوەی خەڵكی ببینێ دەیفەرموو: ئەوە لە ریاوەیە[٩٨]. هەرگیز دەیفەرموو: خەڵكی بە راست گۆیی و دڵسۆزی پلەو پایەیان بەرز دەبێتەوە [٩٩] . لە ژیانیدا

---

[٩٤] المناقب:( ٢١٢) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٥٨/٧) .
[٩٥] المناقب:( ٢١٠) ،ابن حنبل:( ٣٦) ، سير أعلام النبلاء :( ٥٣٣/٧) .
[٩٦] المناقب:( ٢٢٠) .
[٩٧] المناقب:( ٢٢٢) .
[٩٨] المناقب:( ١٩٥ )،ابن حنبل:( ٩٠) .
[٩٩] المناقب:( ١٩٥) .

زۆر بايەخى بە نانى حەڵاڵ وخواردنى حەڵاڵ دەدا و دەيفەرموو: بە خواردنى حەڵاڵ دڵەكان نەرم دەبن[١٠٠] .ئيمامى ئەحمەد زۆر موسڵمانى خۆش دەويست ئەوەتا( اسماعيل بن العلاء) دەڵێ :جارێكيان ( رزق الله الكلواذي ) بانگى كردين بۆ نان خواردن لە ماڵى خۆيان چەند موسڵمانێكى دى بانگ كردبوو لەوانە (ئيمامى ئەحمەدى كوڕى حەنبەل) و( يحيى ى كوڕى مەعين) و (ابو خيثمة) و كۆمەڵێكى دى كاتێك نانيان هێنا بينيان خواردنى ( لوزينجا ) ى بۆ ئامادە كردوون كە هەشتا دەرهەمى تێ چوو بوو ( كە پارەيەكى زۆر بوو ) (ابو خيثمة) فەرمووى: بە راستى ئەمە ئيسرافە.ئيمامى ئەحمەد فەرمووى: باش بزانە ئەگەر ئەم دونيايە هى موسڵمانێك بوايە و بيكردايە بە تەنها پارويەك و بيدا بە برايەكى موسڵمانى خۆى ئەوا ئيسراف نەبوو . يحيى فەرمووى : راست دەكەيت ئەى باوكى عبدالله[١٠١] .

ئيمامى ئەحمەد كابرايەكى زۆر سەغى بوو وەهەرچى بوايە دەيكرد بە خەير ، (هارون المستملي) دەڵێ : –جارێكيان بە ئيمامى ئەحمەد م گوت: لە ماڵەوە هيچمان نييە . ئەويش پێنج دەرهەمى پێدام وفەرمووى لەوە زياتر شك نابەم .[١٠٢]

هەروەكو باسمان كرد كە ئيمامى ئەحمەد زۆر بليمەت بوو لە لەبەر كردنى فەرموودەدا بۆيە جارێكيان پرسيار كرا لە( ابو زرعة) فەرموويان : ئايە تۆ لە لەبەركردندا زيرەگى يا ئيمامى ئەحمەد ؟ فەرمووى : ئيمامى ئەحمەد . فەرموويان :چۆن دەزانى ؟ فەرمووى: كتێبەكانى ئيمامى ئەحمەد م بينى لە سەرەتاى بەشەكانييەوە ناوى فەرمودەناسانى تيادا نەبوو كە فەرموودەكەى لێ

---

[١٠٠] المناقب:( ١٩٦) .

[١٠١] المناقب:( ٢٠٢)،ابن حنبل :(٨٨) ، ئيمامى الذهبي دەڵێت :(ئەم چيرۆكە ( منكر) ە ) سير أعلام النبلاء :( ٥٢٦/٧) .

[١٠٢] المناقب:( ٢٤٠) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٧٩/٧) .

گێڕاوەتەوە چونکە ئیمامی ئەحمەد هەموو بەشێکی لە کەسێکەوە دەبیست لە بەری دەکرد ، کەچی من ئەوە ناتوانم .[١٠٣]

بۆیە هەردەم (ابو زرعة) دەیفەرموو :کەسم نەبینیوە لە فەرموودەناسان و مامۆستایاندا لە لەبەر کردندا زیرەگ بێت وەك ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل [١٠٤].

وە جارێکیان ئیمامی ئەحمەد هەموو قورئانی خوێندەوە ، ئەو جێگایانەی کە باسی (صەبر) دەکات ژماردی بینی لە نەوەت جار زیاترە[١٠٥] .

وەجارێکیان ئیمامی ئەحمەد بە عبدالله ی کوڕی فەرموو : هەر کتێبێك لە کتێبەکانی وەکیع دەخوێنی بخوێنە ئەگەر حەز دەکەیت پرسیارم لێ بکەیت ئەوا تۆ فەرموودەکە بڵێ و من سەنەدەکەی دەڵێم وەیان تۆ سەنەدەکەی بڵێ من فەرموودەکەت بۆ دەڵێم [١٠٦] .

وەئیمامی ئەحمەد زۆر لە خواترس بوو زۆر جار گەر دوعای بکردایە ئەوا خوای گەورە دوعاکەی لێ وەردەگرد (علی بن ابی حرارە) دەڵێت : دایکم بیست ساڵ بوو لە پێ کەوتبوو نەیدەتوانی رێ بکات جارێکیان پێی وتم : کوڕم بڕۆ بۆ لای ئیمامی ئەحمەد داوای لێ بکە کە دوعایەکم بۆ بکات ، منیش چووم بۆلای ئیمامی ئەحمەد و لە دەرگام دا ئەویش فەرمووی : ئەوە کێیە ؟ ووتم : کابرایەکی نزیك ماڵتان دایکم داوای لێ کردووم ( کە ماوەیەکە لە سەر جێ کەوتووە ) داوات لێ بکەم کە دوعایەکی بۆ بکەیت . گوێم لێ بوو وەڵامی دایەوە وەکو کابرایەکی پەست وابوو فەرمووی: ئێمە زیاتر پێویستیمان بە دوعا هەیە بۆ خۆمان . کابرا دەڵێ : منیش گەڕامەوە بەڵام پێش ئەوەی دوور بکەومەوە پیرە

---

[١٠٣] المناقب:( ٦٠)، سير أعلام النبلاء :( ٧/٤٦١) .

[١٠٤] ابن حنبل:( ٨٢) .

[١٠٥] المناقب:( ٢٨٧) .

[١٠٦] المناقب:( ٦٢) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/٤٦٠) .

ژنێك لە ماڵی ئیمامی ئەحمەد هاتە دەرەوە فەرمووی : تۆ بویت کە لە گەڵ ( ابو عبدالله) دا قسەت دەکرد ؟ ووتم : بەڵێ . فەرمووی : کاتێ من بە جێم هێشت دوعای بۆ دایکت دەکرد . دەڵێ : منیش بە پەلە گەڕامەوە ماڵ لە دەرگام دا بینیم دایکم بە پێی خۆی هات دەرگای بۆ کردمەوە و فەرمووی: خوای گەورە لەش ساغی پێ بەخشیم [١٠٧].

## قوتابییەکانی ئیمامی ئەحمەد

ئیمامی ئەحمەد یەکێکە لەو مامۆستایانەی کە لە شارە دوورەکانەوە قوتابیانی زانست و زانیاری روویان دەکردە کۆڕ و کۆمەڵەکەی بۆ وە رگرتنی زانست و نووسینی فەرموودە وە بەسە بۆ ئیمامی ئەحمەد کە ئیمامی (البخاري ) و (مسلم ) (ابو داود)[١٠٨] قوتابی ئەو بن وەهەروەها (یحیی بن ادم الکوفي) و (علي بن المدیني )و(ابن مهدي)[١٠٩] ....هتد .

تەنانەت هەندێ لەوانەی کە فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە مامۆستای خۆی بوونە وەك (ئیمامی شافعی) و( وکیع بن الجراح) و (عبد الرزاق)[١١٠] وە بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی قوتابییەکانی ئیمامی ئەحمەد تەماشای کتێبی (مناقب احمد بن حنبل) (سیر أعلام النبلاء) و (تاریخ بغداد)و( ابن حنبل) و (طبقات الحنابلة) کە ناوی زیاتر لە حەوت سەد کەسی تیادایە.

## وتەی زانایان دەربارەی ئیمامی ئەحمەد *

زۆر لە زانایان ( بەڵکو هەموویان) پێك هاتوون لە سەر ئەوەی کە ئیمامی ئەحمەد شایەنی ئەوەیە بکرێتە پێشەوای موسڵمانان و ئیمامی ئەحمەد

---

[١٠٧] المناقب:( ٢٩٦)، حلية الاولياء:( ٩ :١٨٧) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٧٥/٧) .

[١٠٨] مباحث في تدوين السنة المطهرة:( ١٩٣)الحديث والمحدثون:( ٣٥١) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٥٧/٧) .

[١٠٩] علوم الحديث ومصطلحه:( ٣٩٤) .

[١١٠] الحديث والمحدثون:( ٣٥١) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٥٧/٧) .

* بۆ زانیاری زیاتر تەماشای کتێبی المناقب بکە ( ١٠٦ — ١٤٣) .

لە کردەوەو زانست دا پێشەوا بووە ، جا لێرەدا باسی قسەی هەندێ لە زانایان دەکەین دەربارەی ئیمامی ئەحمەد لەوانە:-

(ذو النون المصري) و( ابو يعقوب البويطي) و( ابو ثور) و (الحسن بن محمد الصباح البزار) دەڵێن [١١١]: -

(ئیمامی ئەحمەد ی کوڕی حەنبەل گەورەی ئێمەیەو مامۆستامانە) .

(يحيى بن ادم )و (سليمان بن حرب )و (محمد بن يحيى الازدي البصري) و (عبد الوهاب الوراق) و (اباعبيد القاسم بن سلام) و (ابو عبدالله محمد بن يحيى الذهلي) دەڵێن[١١٢]: (ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پێشەوامانە)

علي ابن المديني دەڵێ : ئیمامی ئەحمەدم کردووەتە پێشەوایەك لە نێوان خۆم و خوای گەورەدا کێ ئەوە دەتوانێت کە ئەو دەیکات[١١٣].ئیمامی ئەحمەد گەورەی ئێمەیە[١١٤]، فەرمانی پێ کردم لە کتێبەوە نەبێ فەرموودە نەگێڕمەوە[١١٥]، ئیمامی ئەحمەد لە (سەعیدی کوڕی جوبەیر) چاکترە چونکە ئەو لە سەردەمی خۆیدا وێنەی هەبوو بەڵام ئەم وێنەی نییە[١١٦] وە لە هاورێکانمدا کەس نییە وەك ئیمامی ئەحمەد شتی لەبەر بێت وە بیستوومە لە کتێبەوە نەبێ هیچ فەرموودەیەکی نەگێڕاوەتەوە ئەویش بۆ ئێمە نموونەیە[١١٧] ، خوا بیپارێزی ئەمڕۆ حوججەیە بۆ خەڵکی[١١٨]، پەنجا ساڵە دەیناسم هەر لە

---

[١١١] المناقب:( ١٢١ ،١٢٤ ،١٣١)،تاريخ بغداد:( ٤:٤١٧)،سير أعلام النبلاء:( ٧/٤٦٦-٤٦٧) .

[١١٢] المناقب:( ٧٧ ،١٣١ ،١٤٢ ،١١٢ ، ١٢٥ ) ،تاريخ بغداد:( ٤ :٤١٧) ، سير أعلام النــبلاء : ( ٧/ ،٤٦٢،٤٦١ ،٥٢٦) ، الطبقات : ( ١٧) .

[١١٣] المناقب:( ١٠٩ ) ،البداية والنهاية:( ١٠ :٢٨٢) .

[١١٤] المناقب:( ١٠٩ )،طبقات:( ١٧)،حلية الاولياء:( ٩ : ١٦٥ ) ،تاريخ بغداد :(٤ :٤١٧)، سير أعلام النبلاء :( ٧/٤٦٨)

[١١٥] المناقب:( ١٠٩ ) ،ابن حنبل:( ٣٩ ) ،الائمة الاربعة:( ١٦٤)، سير أعلام النبلاء :( ٧/٤٦٨) .

[١١٦] المناقب:( ١٠٩) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/٤٦٦) .

[١١٧] المناقب:( ١٠٩ ،٢٦٠ ) ،ابن حنبل:( ٣٩)، حلية الاولياء :(٩ : ١٦٥) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/٤٦٨) .

[١١٨] المناقب:( ١١٠) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/٤٦٢) .

خەیردا زیاد دەکات[١١٩]، بە ئیمامی ئەحمەدم گوت ئامۆژگاریم بکە فەرمووی: لە خواترسان بکە تێشووی خۆت و هەمیشە دوا ڕۆژت لە بەر چاو بێت[١٢٠]. وە جارێکیان چووم بۆ ماڵی ئیمامی ئەحمەد بە ڕاستی ماڵی ئیمامی ئەحمەد لە زوهد و تەواضع دا بە ماڵی (سوید بن غفلة)[١٢١] دەچوو [١٢٢].

(ابو قاسم بن الخیلي) دەڵێت : زۆر کەس وا تێدەگات کە ئیمامی ئەحمەد لە تاقیکردنەوەکەدا (المحنه )دا زیرەگ بوو بەڵام وانییە ئیمامی ئەحمەد گەر لە هەر بابەتێکدا پرسیاری لێ بکرایە وات دەزانی زانستی هەموو جیهان لە نێو چاوانیدایە[١٢٣].

(ابراهیم الحربي) دەڵێت : من دەڵێم(سعید بن المسیب ) لە سەردەمی خۆیداو (سفیان الثوري) لە سەردەمی خۆیدا و(احمد بن حنبل) لە سەردەمی خۆیدا[١٢٤]. وە لە جێگایەکی تردا دەڵێت : سێ کەسم بینیوە کەس وەك ئەوانی نەبینیوە و دایکان ناتوانن وەك ئەوان بهێنن (أبا عبید القاسم بن سلام) م بینی وەکو شاخێك بوو روحی پیادا کرابێت ( بشر بن الحارث)م بینی لە سەریەوە تاکو پەنجەی پێی بە عەقڵ پڕ کرابوو ، وە( احمد بن حنبل) م بینی وات دەزانی خوای گەورە زانینی پێشینەکان و پاشینەکانی تیادا کۆ کردووەتەوە لە هەموو بابەتێکدا[١٢٥]. وەزانستەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەهلی (مدینه) و (کووفە)و

---

[١١٩] ابن حنبل:( ٨٠).

[١٢٠] المناقب:( ٢٠).

[١٢١] یەکێکە لە گەورە شوێن کەوتووان چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڵام پێش ئەوەی بگات بە پێغەمبەر(ﷺ) ، پێغەمبەر ی خوا(ﷺ) کۆچی دوایی کردبوو پاشان لە خزمەتی ابو بکر و عومەر و عثمان و علی دا بوو خوایان لێ رازی بێت ، یەکێکە لە گەورە زاهیدان.

[١٢٢] المناقب:( ٢٤٩).

[١٢٣] المناقب:( ٦٢).

[١٢٤] المناقب:( ١٣٩ )،ابن حنبل:( ٩٩ )،حلیة الالولیاء:( ٩ : ١٦٦)،تاریخ بغداد:( ٤ :٤١٦)،سیر أعلام النبلاء:(٤٧٠/٧).

[١٢٥] المناقب:( ٦٢ ، ١٤١ ) ، ابن حنبل:( ٨٣)، سیر أعلام النبلاء :( ٤٦١/٧)، طبقات الشافعیة : (٥٧/٢) .

(بەسره)و( شام) ريوايەتيان كردووه لاى چوار كەس كۆ بووەتەوه (يحيى بن معين) و (زهير بن حرب )و( ابي بكر بن ابي شيبة) و (احمد بن حنبل)وه ئيمامى ئەحمەد له هەموويان فەقيه تره[126].

وەكاتێ (سعيدى كوڕى ئيمامى ئەحمەد) كۆچى دوايى كرد (ابراهيم الحربـي ) چوو بۆلاى (عبد الله ى كوڕى ئيمامى ئەحمەد) عبدالله له بەر پێى ابراهيم هەستا ابراهيم فەرمووى: بۆ له بەر پێم هەڵدەستيت ؟ عبدالله فەرمووى :بۆ هەڵنەسم ؟ ئەگەرباوكم تۆى ببينيايه له بەر پێت هەڵدەستا ، ابراهيم فەرمووى: والله ئەگەر( ابن عيينه) باوكتى ببينيايه له بەر پێى هەڵدەستا[127].

وه دەفەرمووێت:- كەسم نەبينيوه زاناتر بێت و له ماناى فەرمووده تێبگات وەكو ئيمامى ئەحمەد .

(أبو الوليد الطيالسي) دەڵێت :كەس نييه له كووفه وبەصرەدا خۆشم بوێت وەك ئيمامى ئەحمەدى كوڕى حەنبەل وەڕێزى له هەمووكەس لاى من زياتره [128]

(ابن شماس) دەڵێت : داوام كرد له وەكيع ئەو فەرموودانەى كه له (خارجة بن مصعب )ەوه ريوايەت كراوه بۆ بگێڕێتەوه فەرمووى : نايگێڕمەوه چونكه ئيمامى ئەحمەد رازى نييه فەرموودەى لێ بگێڕمەوه [129]

(أبو عبيد القاسم بن سلام) دەڵێت : زانست و زانيارى لاى چوار كەس دەست دەكەوێت يەكەميان (احمد بن حنبل) ە كه له هەموويان فەقيهتره (ابن ابي شيبة) له هەموويان زياتر فەرموودەى له بەره و (علي بن المديني) له هەموويان زانيار تره و (يحيى بن معين) له هەموويان زياتر فەرموودەى نوسيوه

---

[126] المناقب:( ١٤٠) .

[127] المناقب:( ١٤٠) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٧٠/٧) .

[128] المناقب:( ٧٢) .

[129] المناقب:( ٧١) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦١/٧) .

[130] وەدەڵێت : كەسم نەبينيوە وەك ئيمامى ئەحمەد شارەزاى سوننەت بێت[131] .

(قتيبة بن سعيد) دەڵێت : ئيمامى ئەحمەدى كوڕى حەنبەل پێشەوامانە كێ پێى رازى نەبێت ئەوا (مبتدع) ە[132]، وەباشترين كەس لەم سەردەمەدا (ابن المبارك)ە ئەمجار ئەو گەنجە فەرموويان: كام گەنج ئەى (ابو رەجا) ؟فەرمووى: (ئەحمەدى كوڕى حەنبەل).فەرموويان : دەڵێيت گەنج و كەچى ئەو مامۆستا (شيخ ) ى عێراقە ؟ فەرمووى : كاتێ من بينيم ئەو گەنج بوو[133] .

وەدەڵێت : ئەگەر كەسێكت بينى ئيمامى ئەحمەدى خۆش دەويست ئەوا بزانە كە لە سەر مەنهەجى ئەهلى سوننەو جەماعەيە و لە سەر رێگاى راستە و ئەگەر لە سەردەمى (الثوري) و (مالك) و ( الأوزاعي) و (الليث بن سعيد) دا بوايە لە پێش هەموويانەوە دەبوو فەرموويان: ئەى قتيبە ئيمامى ئەحمەد دەكەيتە هاوڕێى شوێن كەوتووان ( التابعين )فەرمووى: بەڵكو گەورە شوێن كەوتووان[134] .وە دەڵێت : ئيمامى ئەحمەد لە (يحيى بن يحيى) و( اسحاق بن راهويە) گەورەترە و ئەگەر ئيمامى ئەحمەد كۆچى دوايى بكات لە ناو خەڵكيدا بيدعە پەيدا دەبێتەوە[135] .

وەدەفەرموێت :– ( واتە قتيبە )ئەگەر الثوري نەبێت ئەوا (ورع) نامێنێت وە ئەگەر (ئەحمەد) نەبێت ئەوا بيدعە لە ديندا پەيدا دەبێت ، ئەحمەد پێشەواى ئەم دينەيە . سير اعلام النبلاء(٤٦٥/٧)

---

[130] المناقب:( ١١٢ ) ،ابن حنبل:( ٨٠ ) ، طبقات:( ٥) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٦،٤٦٨/٧) .

[131] ابن حنبل:( ٨٠) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٦/٧) .

[132] طبقات :(١٥).

[133] المناقب:( ٨٠) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/ ٤٦٥) .

[134] المناقب:( ٨١ ) ،طبقات:( ١٧) ، تاريخ بغداد:( ٤ :٤١٧) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٥/٧ ) ، طبقات الفقهاء : ( ١٠١/١) .

[135] المناقب:( ٨٢).

جارێکیان باسی ئیمامی ئەحمەد لای ابو عاصم النبیل کرا فەرمووی : بینیومە ....پاشان بە هاوەڵانی فەرموو: ئەمڕۆ لە بەغدادا کێ شارەزای فەرموودەیە ؟ فەرموویان: یحیی بن معین و احمد بن حنبل و ابو خیثمة و المعیطي و السویدي و ئەوانی دی.فەرمووی: ئەی لە کووفە ؟ فەرموویان: هەردوو کوڕەکەی ابی شیبە و ابن نمیر و ئەوانی دی.فەرمووی: ئەی لە بەصرەدا ؟ فەرموویان: علي بن المدیني و ابن الشاذکوني و ابن عرعرة ابن خدویة و ئەوانی دی ابو عاصم فەرمووی: هاهاها هەموو ئەوانەی کە ناوتان هێنا بینیویانم و هاتوون بۆ لام بەڵام کەسم نەبینیوە وەك ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.

عباس دەڵێت: کاتێ ابو عاصم ئەم قسەیەی فەرموو ئیمامی ئەحمەد تاقینەکرابووەوە[١٣٦].

(أبو عباس النسائي) دەڵێت :ئەگەر ئیمامی ئەحمەد بڕۆیشتایە بۆ لای فەرموودە ناسێك ئیزنی لێ وەردەگرد بۆ ئەو قوتابییەکانی دی تاکو ئەوانیش فەرموودە وەرگرن جا ئەوانیش بە هۆی ئیمامی ئەحمەدەوە فەرموودەیان دەگێڕایەوە[١٣٧]

(یـحیی بن معین) دەڵێت : پەنجا ساڵ هاوەڵی ئیمامی ئەحمەدم کرد ڕۆژێ لە ڕۆژان نەمبینی فەخر بە سەر کەسدا بکات[١٣٨]، وەکەسم نەبینیوە لە بەر خوا قسە بکات سێ کەس نەبێت (یعلی بن عبید) و (القعنبي) و (أحمد بن حنبل)

---

(١٣٦) المناقب :(٧٦ ) ،طبقات:( ٥) ، سیر أعلام النبلاء :( ٤٦٢/٧) .

(١٣٧) المناقب:( ٦٦).

(١٣٨) المناقب:( ٢٧٤ ) ، ابن حنبل:( ٩١) ، سیر أعلام النبلاء :( ٧/ ٤٧٧) .

، خەڵكى دەيەوێت وەكو ئيمامى ئەحمەد بم نەخێر والله هەرگيز وەك ئەو نابم (١٣٩)
. (١٤٠)

وە دەڵێت:لە ئيمامى ئەحمەد دا چەند سيفاتێك بوو لە كەسى تردا نەمبينيوە ئەو فەرموودەناس وحافظ و عالم و لەخواترس و زاهيد و عاقڵ بوو (١٤١)

(أبو عبد الرحمن احمد بن شعيب النسائي) دەڵێت : لە سەردەمى ئيمامى ئەحمەد دا كەس وەك ئەو چوار كەسە نەبووە( علي بن المديني ) و (يحيى بن معين) و ( اسحاق بن راهويه) و( احمد بن حنبل) وە زاناترينيان لە فەرموودەو (عيلەل)ى فەرموودەدا (على بن المدينى)ە وەزاناترينيان لە پياوانى فەرموودەدا (رجال الحديث) و زياتر فەرموودەى كۆ كردبێتەوە (يحيى بن معين) ە وە لە هەموويان زياتر فەرموودەو فيقهى لەبەر بێت( اسحاق بن راهويه) ە بەڵام ئيمامى ئەحمەد لاى من لە اسحاق شارەزاترە لە عيلەلى فەرموودەدا وەزانيارى لە فەرموودەو فيقه و وەرع و زوهد و ئارامگرتندا لە هەموويان زياترە (١٤٢)
.

(أبو بكر الاثرم) دەڵێت : لاى (ابو عبيد) بووم لە گەڵ كابرايەكدا تێڕوانينمان دەكرد (المناظرة ) كابرا فەرمووى : ئەم مەسەلەيە كێ فەرموويەتى؟ ووتم : كەسێك فەرمويەتى لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا وێنەى نييە .فەرمووى: كێيە ؟ ووتم :ئيمامى ئەحمەد ى كوڕى حەنبەل ، ابو عبيد فەرمووى : راست دەكەيت لە رۆژ

---

(١٣٩) المناقب:( ١١٤) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/ ٤٦٦) .

(١٤٠) البداية والنهاية :(١٠ :٢٨٢ ) ،الطبقات: (١٤ ) ، الحديث والمحدثون :(٣٥١) ، ابن حنبل:( ١١) ،المناقب :(١١٥ ) ،حلية الاولياء:( ٩ : ١٦٨) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/ ٤٦٦) .

(١٤١) البداية والنهاية :(١٠ : ٢٨٢ ) ، الحديث والمحدثون :(٣٥١).

(١٤٢) المناقب:( ١٢٧).

هەڵات و ڕۆژئاوادا وێنەی نییە و کەسم نەبینیوە وەکو ئەو شارەزای سوننەت بێت [١٤٣]

پرسیار کرا لە (محمد بن نصر المروزي)فەرموویان: ئیمامی ئەحمەد زیاتر فەرمودەی لایە یا خود (إسحاق بن راهويه) ؟فەرمووی : ئیمامی ئەحمەد ، فەرموویان : ئەی ئیمامی ئەحمەد (مضبوط) ترە یا اسحاق ؟ فەرمووی: ئیمامی ئەحمەد ، فەرموویان:ئیمامی ئەحمەد فەقیهترە یا اسحاق ؟ فەرمووی: ئیمامی ئەحمەد ، فەرموویان: –ئیمامی ئەحمەد زیاتر وەرعی بووە یا اسحاق ؟ فەرمووی: ئیمامی ئەحمەد .. .. پاشان فەرمووی: هەرچی شتێك بڵێن هەر ئیمامی ئەحمەدە ، چونکە ئیمامی ئەحمەد لە هەموو سەردەمی خۆی بردەوە .[١٤٤]وەدەڵێت : جارێکیان پرسیارم لە ئیمامی ئەحمەد کرد ووتم : چۆن (يزيد) سەردانت دەکات کاتێ نەخۆش دەکەویت ؟ فەرمووی: جارێکیان لە واسط لە مەجلیسی یزید دا دانیشتبووم یزید فەرمووی: ( حدثنا يحيى بن سعيد قال سمعت سالم بن عبدالله يقول ...) ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : ووتم : مامۆستا لێرەدا ( سمعت ) نیيە بەڵکو ( إنَّ سالـما قال) یزید چووە ژوورەوە کتێبێکی دەرهێنا بینیمان نوسراوە (إنَّ سالـما) یزید فەرمووی : کێ بوو کە وەڵامی دامەوە ؟ فەرموویان : ئیمامی ئەحمەد ی کوڕی حەنبەل ، فەرمووی: ئەوەی ئەو بنووسن ، جا بۆیە ئەگەر ئیمامی ئەحمەد لە هەر مەجلیسێکدا بوایە یزید دەیفەرموو– لێم نزیك بەرەوە [١٤٥]

---

[١٤٣] المناقب:( ١٤١ ، ١١٣)، الطبقات :(٧) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/ ٤٧١ ) .

[١٤٤] المناقب:( ١٣٧) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/ ٤٧٠ ) .

[١٤٥] المناقب:( ٦٨) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/٤٦٤) .

وەهەروەها (المروزى) دەڵێت : پرسيار كرا لە ئيمامى ئەحمەد فەرموويان : ئەو خەڵكانە چۆن گەيشتونەتە ئەو پلەو پايە تاكو مەدح بكرێن ؟ فەرمووى: بەراست گۆيى [١٤٦] .

(أبو حاتم الرازي) و( ابو داود السجستاني) دەڵێن :ئەگەر كەسێكتان بينى ئيمامى ئەحمەدى خۆش دەويست بزانن ئەوە لە سەر رێبازى سوننەتە [١٤٧] .

وەجارێكيان پرسيار كرا لە ابو حاتم الرازى  فەرموويان : ئايە (احمد بن حنبل) و (على بن المدينى) كاميان زياتر فەرموودەيان لە بەرە ؟ فەرمووى: لە فەرموودە لەبەر كردندا وەك يەكن بەلاَم ئيمامى ئەحمەد فەقيهترە * .

(ابو داود السجستاني )دەڵێت :دووسەد مامۆستام بينيوە ە هەموويان زانا بوون كەسم نەبينيوە وەك ئيمامى ئەحمەدى كورِى حەنبەل ئەگە باسى دونيا بكرايە بێ دەنگ دەبوو بەلاَم ئەگەر باسى زانست بكرايە ئەوا قسەى دەكرد[١٤٨] .

(الهيثم بن جميل) دەڵێت : ئەگەر ئەو گەنجە بژێت دەبێتە حوججەى سەردەمى خۆى (واتە:ئيمامى ئەحمەد ى كورِى حەنبەل )[١٤٩] .

(عبد الرزاق الهمام )دەڵێت : كەس نەهاتووە بۆ لامان وەك ئيمامى ئەحمەدى كورِى حەنبەل وە كەس نييە وەكو ئەو فەقيه بێت[١٥٠] .

وەدەڵێت : چوار كەس لە عێراقەوە هاتن بۆ لامان لە فەرموودەدا سەركردە بوون يەكەميان ( الشاذكوني) بوو كە لە هەموويان زياتر فەرموودەى

---

(١٤٦) المناقب:( ٢٠٠).

(١٤٧) المناقب:( ١٢٣ ، ١٣٩) سير أعلام النبلاء :( ٥٦٧/٧) .

* سير أعلام النبلاء : ( ٤٦٧/٧) .

(١٤٨) المناقب:( ١٣٩).

(١٤٩) ابن حنبل:( ١٩) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٥/٧) .

(١٥٠) المناقب:( ٦٩).

لە بەر بوو ، وە دووەمیان( علي بن المديني ) بوو لە هەموویان شارەزاتر بوو لە جیاوازی فەرموودەکاندا وە سێیەمیان (یحیی بن معین) بوو لە هەموویان زیاتر پیاوانی فەرموودەی دەناسی وە چوارەمیان ( احمد بن حنبل )بوو لەو زانیاریانەی ئەواندا لە هەموویان بلیمەت تر بوو .[١٥١]

وەدەڵێت : سێ کەس لە منەوە فەرموودەیان وەرگرد بایەخی پێ نادەم گەر کەسیتر نەینوسێت ( ابن الشاذكوني) کە لە هەمویان زیاتری لە بەر بوو وە (یحیی بن معین) لە هەمووکەس زیاتر پیاوانی فەرموودەی دەناسی وە (احمد بن حنبل) لە هەموویان لە خواترس تر بوو .وەدەڵێت : کەسم نەبینیوە وەك ئیمامی ئەحمەد ، ئەگەر ئەو پیاوە بژێت دەبێتە جێگری هەموزانایان .[١٥٢]

وە هەوەها عبدالرزاق دەفەرمووێت :- کەسم نەبینیوە لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەقیهترو لە خواترستر بێت .. (الخطيب البغدادي) دەڵێت :- ئەمە لە کاتێکدایە کە عبدالرزاق کەسانی وەك ( الثوري ومالك و ابن جريج ) ی بینیوە .*

(وكيع بن الجراح )و (حفص بن غياث النخعي) دەڵێن : کەس نەهاتووە بۆ کووفە وەکو ئەو گەنجە ( واتە:احمد بن حنبل )[١٥٣]

(حجاج بن الشاعر) دەڵێت : کەسم نەبینیوە وەك ئیمامی ئەحمەد ، شەوی وابوو پێکەوە دادەنیشتین کاتێ دەگەڕامەوە بۆ ماڵ لە خۆشەویستی ئەودا بیرم دەکرد و دەستم دەکرد بە گریان[١٥٤] .

وەدەڵێت:-کەسم نەبینیوە لە ئەحمەد چاکتر بێت ، سوێند بە خوا ئەو لە پێشەوایەتیدا لە (مالك و سفيان) گەورەترە .

---

[١٥١] المناقب:( ٦٩).
[١٥٢] المناقب:( ٧٠) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٤/٧) .
* سير أعلام النبلاء : ( ٤٦٧/٧) .
[١٥٣] المناقب:( ٧١) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/ ٤٦٥) .
[١٥٤] المناقب:( ١٣٥).

(اسماعيل بن خليل) دەڵێت : ئەگەر ئیمامی ئەحمەد لە ناو بنی ئیسرائیل دا هەڵبکەوتایە دەبووە ئایەتێك [١٥٥]( لە جێگەیەکی تردا دەڵێت : پێغەمبەرێك)[١٥٦]

(اسحاق بن ابراهيم الحنظلي) دەڵێت : ئیمامی ئەحمەد حوججەیە لە نێوان خوداو بەندەکانی لە سەر زەویدا[١٥٧].

(زكريا بن يحيى الساجي) دەڵێت :لای من ئیمامی ئەحمەد لە (مالك و الأوزاعي و الثوري والشافعی) باشترە چونکە ئەوان وێنەیان بوو بەڵام ئەم وێنەی نییە[١٥٨].

(يحيى بن سعيد القطان) دەڵێت :کەس نەهاتووە بۆ لام وەکو ئیمامی ئەحمەد ،وە کەس نەهاتووە بۆ بەغدا خۆشەویستر بێت لام وەك ئیمامی ئەحمەد .ئیمامی ئەحمەد یش دەڵێت : کەسم نەبینیوە وەك يحيى بن سعيد [١٥٩]. وە ئەو رۆژەی کە (بەصرە)م بە جێهێشت یحیی زۆری پیێ ناخۆش بوو .

(ابو سهل البغدادي) دەڵێت : لە هەموو سەردەمێکدا کەسێك دەبێتە حوججە ، (الفضيل بن العياض) حوجەی سەردەمی خۆی بوو، وە ئەگەر ئەو گەنجە بژێت دەبێتە حوججەی سەردەمی خۆی (واتە : أحمد بن حنبل )[١٦٠].

وەجارێکیان (أبو سهل) باسی فەرموودەکانی (هُشَیم) ی دەکرد فەرموویان : لە فەرموودەدا لە گەڵ تۆدا یەك دەنگ نین . فەرمووی:_کێیە ؟ فەرموویان : ئیمامی ئەحمەد ی کوری حەنبەل فەرمووی: حەزم دەکرد لە

---

[١٥٥] المناقب:( ١٣٦) ،حلية الاولياء:( ٩ : ١٦٧) ، تاريخ بغداد:( ٤ : ٤١٨) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٧٠/٧ ) .

[١٥٦] البداية والنهاية : ( ٢٨١/١٠) .

[١٥٧] الطبقات:( ١٧ ) ، الحديث والمحدثون:( ٣٥١ ) ، تاريخ بغداد:( ٤ : ٤١٧).

[١٥٨] الطبقات:( ١٨).

[١٥٩] البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٨١ ) ،المناقب:( ٧٤) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٢/٧) .

[١٦٠] المناقب:( ٧٨).

[١٦١] المناقب:( ٧٨).

تەمەنی من کەم بکرێتەوە و بخرێتە سەر تەمەنی ئەو چونکە ئەو سوودی بۆ موسڵمانان زیاترە [١٦١].

(خلف بن سالم) دەڵێت : لە مەجلیسی (یزید بن هارون) دانیشتبوین یزید لە گەڵ ئەوانەی کە دەیان نوسی گاڵتەیەکی کرد ، ئیمامی ئەحمەد لە بەر خۆیەوە چەند قسەیەکی کرد ، یزید بە دەستی دای بە نێو چاوانی خۆیدا وفەرمووی : بۆ پێم ناڵێن ئیمامی ئەحمەد دانیشتووە تاکو گاڵتە نەکەم [١٦٢].

ئەحمەدی کوڕی (سنان القطان) دەفەرمووێت :- هیچ کەسێکم نەبینیوە (یزید) بەو شێوەیە بە گەورەیی تەماشای بکات چۆن تەماشای ئەحمەدی دەکرد وە لە هیچ کەسێك بەو شێوەیە رێزی نەدەگرد ، گەر دابنیشتایە لە تەنیشتی خۆیەوە دایدەنا و گاڵتەی لە گەڵدا نەدەکرد *.

(احمد بن شیبان )دەڵێت : (یزید بن هارون) هیچ کەسێکی وا بە گەورەیی و مەزنی و رێزەوە تەماشا نەدەکرد چۆن بۆ ئیمامی ئەحمەد دەیکرد وەئەگەر قسەی بۆ بکردینایە لە تەنیشتییەوە دادەنیشت و زۆر شەرمی لێ دەکرد و گاڵتەی لە گەڵدا نەدەکرد وە کاتێ ئیمامی ئەحمەد نەخۆش کەوت سەردانی کرد [١٦٣].

کاتێ باسی ئیمامی ئەحمەد بکرایە لای (محمد بن معمرانـي الجمال) دەیفەرموو : کەس نەماوە رووی دڵی تێ بکەم ، کاتێ روو دەکەمە مەککە و مەدینە و بەصرە و کووفە و شام و جەزیرە وخوراسان و رووی دڵم دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو [١٦٤]

---

[١٦٢] ابن حنبل:( ٣٧ ) ،المناقب:( ٦٧) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٥/٧) .

* سير اعلام النبلاء ( ٤٦٥/٧).

[١٦٣] المناقب:( ٦٧).

[١٦٤] المناقب:( ١٢٣).

(محمد بن مسلم بن وارة القومسي) دەڵێت : ( احمد بن صالح) له میصر،( احمد بن حنبل) له بەغدا (النفيلي) له حەڕان ،( محمد بن عبدالله) له کووفە ، روکنی ئەم دینەن[١٦٥] .

(يعقوب بن سفيان) دەڵێت : له هەزار مامۆستا(شيخ )ەوە فەرموودەم نوسیوە حوججەی نێوان من و خودا دوو کەسە فەرموویان : کێیە ؟فەرمووی:( احمد بن صالح المصري)و( احمد بن حنبل) ە [١٦٦] .

(ابو همام الوليد بن شجاع السكوني) دەڵێت : کەسم نەبینیوە وەکو ئیمامی ئەحمەد وە ئیمامی ئەحمەدیش کەسی نەبینیوە وەکو خۆی[١٦٧] .

ئەحمەد ی کوڕی سەعیدی الرازی دەفەرمووێت :—کەسم نەبینیوە وەك ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموودەکانی پێغەمبەری لە بەر بێت(ﷺ) و لە ماناکەی و فیقهەکەی تێگەیشتوو بێت * .

(ابو عمير الطالقاني) دەڵێت : مامۆستاکانم دەیانفەرموو( احمد بن حنبل) بیلبیلەی چاوی ئیسلامە .[١٦٨]

وەجارێکیان لە مەجلیسی (إسماعيل بن علية) دا کابرایەك گاڵتەیەکی کرد زۆربەیان پێکەنین ئیمامی ئەحمەدیش دانیشتبوو پاشان چوون بۆ لای اسماعیل بینیان پەست بووە فەرمووی : پێدەکەنن و ئیمامی ئەحمەدیش دانیشتووە ! ؟ وەئەگەر قامەت بۆ نوێژ بکرایە(إسماعيل بن علية) دەیفەرموو : ئەگەر ئیمامی ئەحمەد لێرەیە پێی بڵێن با پێش کەوێت [١٦٩]

---

[١٦٥] المناقب:( ١٢٩ ) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٩/٧ ) .
[١٦٦] المناقب:( ١٣٠ ) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٩/٧ ) .
[١٦٧] المناقب:( ١٣٢ ) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٧/٧ ) .
* المناقب : ( ٦٣ ) ، ابن حنبل :( ٨٠ ) .
[١٦٨] المناقب:( ١٣٧ ).
[١٦٩] المناقب:( ٦٨ ) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٤/٧ ) .

(أبـي العوام البزاز) دەڵێت :لای( ابو الولید) دانیشتبوین ابو الولید ڕاکشابوو فەرموویان : ئیمامی ئەحمەد هات، (أبو الولید) ڕاستەوە بوو دانیشت و بێ دەنگ بوو ، ئیمامی ئەحمەد چەند پرسیارێکی لێ کرد ئەویش وەڵامی دەدایەوە منیش لە دڵی خۆمدا ووتم : ئێمە هەموومان مامۆستاین (شیخ) ین کەچی (ابو الولید) لە بەر ئیمامی ئەحمەد دانیشت و ڕاستەوە بوو [١٧٠]

(عبد الرحمن بن مهدي) دەڵێت :کەس نییە شارەزای فەرموودەکانی (سفیان الثوري) بێت وەکو ئیمامی ئەحمەد ، وەچ کاتێك تەماشای ئیمامی ئەحمەد بکەم (سفیان)م دەکەوێتەیاد، کێ دەیەوێت سفیان ببینێ ئەوا با تەماشای ئیمامی ئەحمەد بکات[١٧١] .

(عبد الوهاب الوراق) دەڵێت : کەسم نەبینیوە وەك ئیمامی ئەحمەد فەرموویان :چێ وای لێ کردووی کە ئەوەندە بەرزی کەیتەوە بە سەر ئەوانیتردا؟ فەرمووی: کەسێك پرسیاری لێ کرابێت دەربارەی شەست هەزار مەسەلە بۆ هەمووی وەڵامی دایەوە بە( حدثنا و أخبرنا)[١٧٢]

(الـحمیدي) دەڵێت : تاکو من لە حیجاز و ئیمامی ئەحمەد لە بەغدا و اسحاق لە خوراسان بێت کەس بە سەرماندا سەر ناکەوێت .[١٧٣]

النفیلی دەفەرمووێت : ئەحمەد ی کوڕی حەنبەل یەکێکە لە ناودارانی ئەم دینە* .

---

[١٧٠] المناقب:( ٧٢).

[١٧١] ابن حنبل:( ٨١ ، ٩٩ ) ،المناقب:( ٧٣) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٢/٧) .

[١٧٢] المناقب:( ١٤٢ ) ،الطبقات:( ٦).

[١٧٣] المناقب :(١٠٨) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٨/٧) .

* سير اعلام النبلاء(٤٦٦/٧) .

جارێكيان لاى (ابن أبي أوس) بووين فەرموويان :فەرموودەناسان رۆيشتن فەرمووى : خواى گەورە (ئيمامى ئەحمەدى كوڕى حەنبەل )ى بۆ هێشتينەتەوە جارێ فەرموودەناسان ماون (١٧٤).

(ابو ثور) دەڵێت: ئيمامى ئەحمەد لە ثوري زاناترو فەقيهترە(١٧٥).

وەدەڵێت : ئەگەر كەسێك بڵێت (ئيمامى ئەحمەدى كوڕى حەنبەل) يەكێكە لە ئەهلى بەهەشت ئەوا زيادەرەوى نەكردووە چونكە گەر بچيت بۆ خوراسان ودەوروبەرى دەڵێن :ئيمامى ئەحمەد پياو چاكە و گەر بچيت بۆ عێراق و شام ودەوروبەرى دەڵێن : ئيمامى ئەحمەد پياو چاكە ، جا ئەمەش بە كۆڕاى زانايان دادەنرێت.(١٧٦)

(ابو عبد الله احمد بن يحيى الذهلي) دەڵێت :ئيمامى ئەحمەدم كردووەتە پێشەوايەك لە نێوان خۆم و خواى گەورە دا (١٧٧)

(سفيان بن وكيع) دەڵێت :ئەوەى ئيمامى ئەحمەد عەيبدار بكات فاسقە (١٧٨).

(احمد بن صالح المصري) دەڵێت : لە عێراقدا كەسم نەبينيوە وەك ئەو دوو پياوە( ئيمامى ئەحمەد) لە بەغداو (محمد بن عبدالله بن نمير) لە كووفە* .

(نصر بن علي) دەڵێت : ئيمامى ئەحمەد باشترين كەسى سەردەمى خۆيەتى .(١٧٩)

---

(١٧٤) المناقب:( ١٠٨) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٨/٧) .

(١٧٥) البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٨٢ ) ، ابن حنبل :(٥ ) ،الطبقات:( ٧ ) ،المناقب:( ١٢٤) ، سير أعـلام النـبلاء :( ٤٦٧/٧) ،طبقات الفقهاء :( ١٠١/١) .

(١٧٦) المناقب:( ١٢٤ ) ، ابن حنبل:( ٥).

(١٧٧) المناقب:( ١٢٥) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٧/٧) .

(١٧٨) المناقب:( ١٢٥) ، تاريخ بغداد : ( ٤٢٠/٤) .

* سير اعلام النبلاء:(٤٦٦/٧) ، المناقب : ( ١٢٦) .

(١٧٩) المناقب:( ١٢٨) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٧/٧) ، تاريخ بغداد : ( ٤١٧/٤) .

(ابو معمر اسماعیل بن ابراهیم الهذلي القطیعي) دەڵێت : پەنجا ساڵە وەك ئیمامی ئەحمەدم نەبینیوە لە تەمەنی گەنجییەوە ئەو زانیارتر دەبێت[١٨٠] .

(عمر بن محمد الناقد) دەڵێت : گەر ئیمامی ئەحمەد لە فەرموودەیەکدا (موافق) م بێت گوێی پێ نادەم گەر خەڵکی( مخالف) م بێت[١٨١]

(احمد بن الحجاج) دەڵێت: کەسم نەبینیوە وەکو ئیمامی ئەحمەد گەر لە سەردەمی (ابن المبارك) دا بوایە دەمانگوت لەو چاکترە[١٨٢]

پرسیار کرا لە (ابو مسهر الغسانی) :- ئایە کەسێك دەناسیت لەم ئوممەتەدا ئەمر(کاروبار)ی ئەم دینەی لە بەر بێت ؟ فەرمووی:- گەنجێك لە ڕۆژهەڵاتە (واتە : ئەحمەد) .

## دەست پێ کردنی تاقیکردنەوە ﴿ المحنة ﴾[١٨٣]

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت:- ﴿الـم (١) أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لاَ يُفْتَنُونَ (٢) وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ (٣)﴾ وە پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) چ کەسێك زۆر تووشی بەلا دەبێت ؟ فەرمووی : پێغەمبەران ئەمجار ئەوانەی وەکو ئەوانن ئەمجار ئەوانەی وەکو ئەوانن ، جا ئیمامی ئەحمەد توشی تاقیکردنەوەیەکی سەخت بوو کە هیچ کەسێك نەیدەتوانی بەرانبەری راوەستێ جگە لە ئیمامی ئەحمەد نەبێ ،( رەبیع) دەڵێت : ئیمامی شافعی کاتێ لە میسر بوو پێی وتم : ئەی (رەبیع) ئەم نامەیە ببە بۆ( احمد بن حنبل) لە بەغدا و وەڵامەکەیم بۆ بهێنەرەوە ، رەبیع دەڵێت : کاتێ گەیشتمە بەغدا شەبەق بوو

---

[١٨٠] المناقب:( ١٢٨).

[١٨١] المناقب:( ١٢٨) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/ ٤٦٧) .

[١٨٢] المناقب:( ١٢٩).

[١٨٣] ابن حنبل:( ٤٣-٦٨).

چووم بۆ مزگەوتەكەی ئیمامی ئەحمەد نوێژم كرد و پاشان نامەكەم دا بە دەستی ئیمامی ئەحمەد ووتم : ئەمە نامەی ئیمامی شافعی یە لە میسرەوە بۆی ناردووی ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : تەماشات كردووە ؟ ووتم : نەخێر ، كاتێ نامەكەی كردەوە و خوێندییەوە چاوەكانی پڕ بوو لە فرمێسك ، ووتم : ئەی باوكی عبد الله چی تیادایە ؟ ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : (ئیمامی شافعی) دەڵێت: پێغەمبەری خوام (ﷺ) لە خەودا بینیوە و پێی فەرمووم : نامەیەك بنووسە بۆ( باوكی عبدالله ئەحمەدی كوڕی حەنبەل) سەلامی منی پێ بگەیەنە و پێی بڵێ : كە تاقیدەكرێتەوە و بانگی دەكەن بۆ ئەوەی كە گوایە قورئان دروست كراوە تۆیش وەڵامیان مەدەرەوە خوای گەورە بە عیلم بەرزت دەكاتەوە تا رۆژی قیامەت ، (رەبیع) دەڵێت : ووتم : مزگێنیم بدەرێ ، ئیمامی ئەحمەد یش كراسەكەی كە لە بەر دا بوو پێی دام ، گەڕامەوە بۆ میسر، وەڵامی نامەكەم گەیاندە (ئیمامی شافعی) ،(ئیمامی شافعی )فەرمووی : چی پێت دا ؟ ووتم : كراسەكەی كە لە سەر پێستەكەی بوو،(ئیمامی شافعی ) فەرمووی : لێت ناسێنم بەڵام تەڕی بكەو بیدە پێمان با منیش شەریكت بم .[١٨٤]

## سەرەتایەك دەربارەی كێشەكە

تاكو سەردەمی خەلیفە( هارون الرشید) خەڵكی لە سەر بەرنامەی پاك و پاراوی پێشین بوون و دەیان فەرموو : قورئان كەلامی خوایە و دروست كراو نییە ، بەڵام كاتێ كۆمەڵی (المعتزلة) پەیدا بوون ئەوەیان بڵاو كردەوە كە قورئان یەكێكە لە دروست كراوەكانی خوا بەڵام لەم سەردەمەدا بە نهێنی بوو كاتێ ئەم قسەیە گەیشتە (هارون الرشید) فەرمووی: بیستومە كە (بشر المریسی) گوتویەتی قورئان دروست كراوە سوێند بە خوا گەر بیدۆزمەوە دەبێ بە شێوەیەك بیكوژم كەس وا نەكوژرابێت بۆیە (بشر المریسی) خۆی دەرنەخست

(١٨٤) البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٧٨ ) ،المناقب:( ٤٥٥).

تاكو (هارون الرشيد) كۆچى دوايى كرد ئەمجار خۆى دەرخست و بانگەوازى خەڵكى كرد بۆ ئەو گومڕايى يە ،وە لە كاتى( الأمين)شدا نەيدەوێرا نزيك بكەوێتەوە و بەزەقى گومڕايەكەى بڵاو بكاتەوە بەڵام كاتىٚ( مأمون) بوو بە خەليفە چەند كەسێك لە زانايانى(المعتزلة) بوون بە هاوڕێى و نزيكى و توانيان قەناعەتى پىٚ بكەن كە قورئان دروست كراوى خوايە ( ولا حول ولا قوة الا بالله)[١٨٥]

## دەست پىٚ كردنى (المحنة)

لە مانگى رەبيعى يەكەمى ساڵى ٢١٢ كۆچى خەليفەى موسڵمانان (مأمون) دووبيدعەى لەناو خەڵكيدا بڵاو كردەوە يەك لە يەك گومڕا ترو خراپتر بوو ، يەكەميان ئەوە بوو كە دەيگوت قورئانى پيرۆز دروست كراوى خوايە (القرآن مخلوق ) وە دووەميان ئەوە بوو كە دەيگوت : (علي بن ابي طالب) لە هەمووخەڵكى باشترە(مەبەستى ابو بكر و عمر بوو ) بێگومان ئەمە هەڵە و تاوانێكى گەورەيە[١٨٦] ، وە لە ساڵى ٢١٨ ك مأمون كە خۆى لە طرسوس بوو نوسراوێكى نارد بۆ جێگرەكەى خۆى لە بەغدا كە (اسحاق بن ابراهيم بن مصعب) بوو تيايدا فەرمانى پىٚ كردبوو كە هەموو قازى و فەرموودەناسان تاقيبكاتەوە دەربارەى قورئان كە ئايە دروست كراوە يان نا ، وە كۆمەڵێكيان بۆ بنێرێت بۆ لاى خۆى وچەند نوسراوێكى دى نارد كە زياتر بايەخى دەدا بەو مەسەلەيە، هەموو ئەو نوسراوانە (ابن جرير) لە كتێبەكەيدا نوسيويەتى[١٨٧] وە ئەم قسەيە نەك تەنها فەرموودەناسان و زانايانى ئەهلى سوننەو جەماعە پێى رازى نەبوون تەنانەت زانايانى ئەهلى كەلاميش هەموو لە سەرى يەك دەنگ نەبوون[١٨٨]،

---

[١٨٥] المناقب:( ٣٠٨ ) ، ابن حنبل :(٤٤) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/٤٩٠) .

[١٨٦] البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٢٣).

[١٨٧] البداية والنهاية :(١٠ : ٢٢٨ ) المناقب:( ٣١٠).

[١٨٨] بۆ وەرگرتنى زانيارى زياتر تەماشاى كتێبى البداية والنهاية بكە:( ١٠ : ٢٢٨ ، ٣٢٧).

وەكاتیێ نامەكانی (مأمون) دەگەیشتە بەغدا بە سەر خەڵكیدا دەخوێنرایەوە ، وەلە یەكێك لە نامەكاندا (مأمون) چەند كەسێكی دیاری كردبوو كە بینێرن بۆ لای خۆی ئەوانیش فەرموودە ناسان بوون لەوانە: (محمد بن سعد كاتب الواقدي) و (أبو مسلم المستملي ) و (يزيد بن هارون) و( يحيى بن معين) و (ابو خيثمة) و (زهير بن حرب) و(احمد بن الدورق) وە هەموویانی نارد بۆ لای (مأمون) كە لە شاری (الرقة) بوو وە هەموو تاقیكرانەوە ئەوانیش بە ناچاری دانیان نا بەوەدا كە قورئان دروست كراوە ، پاشان (مأمون) هەموویانی گەڕانەوە بۆ بەغدا و فەرمانی كرد كە لە ناو فەقیهەكاندا بڵاو بكرێتەوە ، اسحاق فەرمانەكەی (مأمون) ی جێ بە جێ كرد ئەمجار اسحاق خەڵكێكی زۆری كۆ كردەوە لە فەرموودەناسان و فەقیهەكان و پێشەوا و وتاربێژی مزگەوتەكان و خەڵكی دی وە بانگەوازی هەموویان كران بۆ ئەو مەبەستە بە فەرمانی (مأمون) وەباسی ئەوەی بۆ كردن كە فەرموودەناسان رازی بوون لە سەر ئەو قسەیە ئەمجار ئەوانیش بە ناچاری رازی بوون لە سەر ئەوەو لە ناو خەڵكیدا فیتنەیەكی گەورە بڵاو بووەوە ، إنا لله وإنا إليه راجعون .[189]

ئەمجار (مأمون) چەند نوسراوێكی نارد بۆ اسحاق كەتیایدا هەندێ شوبهەی هێنایەوە بە مەبەستی بەڵگە هەرچەند هیچ لەوانە بەڵگە نەبوون بەڵكو بەڵگە بوون لە سەر خۆیان (ابن جرير) باسی ئەو شوبهانە دەكات ، وەفەرمان بە اسحاق كرا كە بۆ خەڵكی بخوێنێتەوە و بانگەواز بكات بۆ ئەوەی كە قورئان یەكێكە لەدروست كراوەكانی خوا ئەمجار اسحاق كۆمەڵێكی دی بانگ كرد لەوانە (احمد بن حنبل ) و (قتيبة) و (ابو حيان الزيادي) و (بشر بن الوليد ) و (علي بن

---
[189] البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٢٨).

ابي مقاتل) و ( سعدوية الواسطي) و (علي بن الجعد) و( اسحاق بن ابي اسرائيل) و (ابن الهرش) و( ابن علية الاكبر) .. .. هتد [١٩٠]

کاتێ ئەو کۆمەڵە کەسە چوونە ژوورەوە اسحاق نوسراوەکەی( مأمون) ی خوێندەوە ئەمجار رووی کردە (بشر بن الوليد) فەرمووی : چ دەڵێیت دەربارەی قورئان ؟فەرمووی: کەلامی خوایە ، فەرمووی: دەربارەی ئەوە پرسیار ناکەم ، ئایە دروست کراوە ؟ فەرمووی : دروستکەر(خالق ) نییە ، اسحاق فەرمووی : دەربارەی ئەوەش پرسیار ناکەم . ئەویش فەرمووی : لەوە باشتر نازانم و سوور بوو لە سەر ئەم قسەیە ، پاشان اسحاق فەرمووی : ئایە شایەتی دەدەی کە هیچ خوایەك نییە تەنها( الله ) نەبێت ،تاك وتەنهایە ، هیچ شتێك پێش ئەو نەبووە و پاشی ئەویش هیچ نییە ، هیچ شتێك لە وێنەی نییە لە دروست کراوەکانی و لە مانایەك لە ماناکانی و هیچ روویەك لە رووەکانی ؟فەرمووی: بەڵێ ، ئەویش بە کاتبەکەی فەرموو : ئەوەی کە فەرمووی بینوسە ، ئەویش نوسی .

ئەمجار یەك بە یەك تاقییانی کردەوە زۆربەیان رازی نەدەبوون لە سەر ئەوەی کە قورئان دروست کراوێکە لە دروست کراوەکانی خوا ، بەو شێوەی کە (بشر بن الوليد) تاقیکرایەوە ئەوانیش تاقیکرانەوە ئەوانیش دەیانفەرموو : بەڵێ .کاتێ کە ئیمامی ئەحمەد هاتە پێشەوە اسحاق فەرمووی : ئایە دەڵێیت قورئان دروست کراوە ئەویش فەرمووی: قورئان کەلامی خوایە و لەمەیش زیاتر ناڵێم . فەرمووی : چ دەڵێیت بەو نوسینەی کە خوێندمانەوە ؟فەرمووی: دەڵێم (ليس كمثله شئ وهو السميع البصير ) یەکێك لە موعتەزیلەکان کە ناوی (ابن البكاء الاصغر) بوو فەرمووی : ئەوە دەڵێت خوای گەورە دەبیسێ بە گوێ و دەبینێ بە چاو ، اسحاق فەرمووی : چیت دەوێت بەو قسەیەت کە دەڵێیت ( سميعٌ بصير) ؟فەرمووی: ئەوەم دەوێت کە خوای گەورە دەیەوێت ئەویش ئەوەیە کە خۆی

---

[١٩٠] البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٢٩).

وەسفى خۆى كردووە و لەمە زياتر نالێم ، (إسحاق)يش وەڵامى هەموويانى يەك يەك ناردن بۆ لاى (مأمون) ، وەهەبوو لە دانيشتوان بە ناچارى دەيفەرموو قورئان دروست كراوە چونكە برِيار بوو هەر كەسێك نەڵێت ئەوا لە سەر كارەكەى لادەبرێت و ئەگەر لە (بيت المال) ەوە پارەى بۆ بهاتبايە ئەوا چيتر نەدەهات و ئەگەر (مفتى) بوايە نەياندەهێشت فەتوا بدات و ئەگەر فەرموودەناس بوايە نەياندەهێشت كەس گوێى لىَ بگرێت و گوىَ لە كەس بگرێت وئەم فيتنەيە بڵاو بووە وە ولاحول ولا قوة الابالله .[191]

كاتىَ وەڵامى نامەكان گەيشتە (مأمون) سوپاسنامەيەكى نارد بۆ اسحاق و دەست خۆشى لىَ كرد وەڵامى هەر يەكەى لەوانە دايەوە كە ناويان هاتبوو لە نامەكەى اسحاقدا ئەمجار فەرمانى كرد ديسانەوە تاقيان بكاتەوە ئەگەر هەر كەسێك رازى بوو با لە ناو خەڵكيدا بڵاوى بكاتەوە گەر رازى نەبوو ئەوا بە بەستراوى بيان نيرە بۆ سەربازگەى (مأمون) بە پارێزراوى بۆ ئەوەى (مأمون) خۆى بە چاوى خۆى بيانبينىَ چونكە مأمون بەڵێنى داوە كىَ رازى نەبێت ئەوا بە شير(شمشێر) لە گەڵيدا بجوڵێتەوە ديسان اسحاق ئەو زانايانەى كۆ كردەوە لەوانە (ابراهيم المهدي) كە هاورِێى (بشر بن الوليد الكندي) بوو ، چونكە (مأمون) فەرمانى كردبوو گەر ئەو دوو كەسە رازى نەبوون ئەوا بيانكوژن بەڵام كاتىَ تاقيكرانەوە رازى بوون ئەو ئايەتەى خواى گەورەيان كردە بەڵگە كە دەڵێت ﴿إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ﴾ هەموويان رازى بوون تەنها چوار كەس نەبێت ئەوانيش (محمدى كورِى نوح الجنديسابورى) و( الحسن ى كورِى حماد ى السجادە ) و( عبيد الله ى كورِى عمر القواريري) و( ئيمامى ئەحمەدى كورِى حەنبەل ) اسحاق ئەو چوار كەسەى كەلەپچە كردو ئامادەى كردن كە بياننێرێت بۆ لاى (مأمون) ، بۆ سبەينى ديسان تاقيانى كردەوە بەڵام( سجادة)

---

(١٩١) البداية والنهاية:( ١٠ :٢٢٩).

وەڵامی دانەوە و ڕازی بوو ئەویش ئازاد کرا ئەمجار بۆ ڕۆژی سێیەم بانگی کردن و تاقیکردنەوە بەڵام (القواريري) وەڵامی دانەوە و ڕازی بوو ئەویش ئازاد کرا ، بەڵام ئەو دوو کەسەی کە وەڵامی نەدانەوە (احمد بن حنبل) و(محمد بن نوح) بوون ئەوانیش سووربوون لە سەر قسەی خۆیان (اسحاق)یش بە ئاسن و زنجیر و کەلەپچە توند بەستنی و ناردنی بۆ لای (مأمون) کە لە طرسوس بوو لە گەڵیاندا نوسراوێکی نارد[١٩٢]،ئا لەو کاتەدا کە ئیمامی ئەحمەد لە بەندیخانەبوو لای اسحاق ، اسحاق بە هاوڕێکانی خۆی گوتبوو : گەر خواردنیان هێنا بۆ ئیمامی ئەحمەد پێم خۆشە بیبینم کاتێ هێنایان بینی وا دوو نان و یەك خەیارە اسحاق فەرمووی : کەسێك بە ئەمە ڕازی بێت وەڵاممان ناداتەوە .[١٩٣]

أحمد و محمد بن نوح بە بەند کراوی لە سەر یەك حوشتر بەڕێ کەوتن لە ڕێگادا ئیمامی ئەحمەد دوعای دەکرد کە لەگەڵ (مأمون) دا کۆ نەبێتەوە و چاوی بە چاوی نەکەوێت[١٩٤] ، (صالح ی کوڕی ئیمامی ئەحمەد) دەڵێت : تاکو ئەنبار لە گەڵیاندا ڕۆیشتین (ابو بكر الأحول) بە باوکمی فەرموو: ئەی باوکی عبدالله گەر ناچاریان کردیت کە بە شیر ( شمشێر) وەڵامت دەدەنەوە لە قسەی خۆت دەگەڕێیتەوە ؟ فەرمووی : نەخێر[١٩٥].

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : هیچ وتەیەك زۆر کاریگەری نەبووە لە سەرم وەك قسەی ئەو کابرا دەشتەکییە کە ناوی( جابر بن عامر) بوو ، پێی وتم : (ئەمڕۆ تۆ نوێنەری خەڵکیت تۆیش ڕەشبین مەبە لە سەریان و تۆ ئەمڕۆ گەورەی خەڵکیت ئاگادار بە وەڵامیان نەدەیتەوە گوناهی هەموو هەڵبگریت لە ڕۆژی قیامەتدا ، وەئەگەر خوات خۆش دەوێت ئارام بگرە لە ئەوەی کە لە سەریت

---

(١٩٢) البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٢٩) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/ ٤٩٠) .

(١٩٣) المناقب:( ٢٥٢) ، سير أعلام النبلاء :( ٥٣٨/٧) .

(١٩٤) البداية والنهاية:( ١٠ :٢٢٩).

(١٩٥) المناقب:( ٣١٢) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٩٢/٧) .

باش بزانە لە نێوان تۆ و بەهەشتدا هیچ شتێك نییە تەنها كوشتنت نەبێت و گەر نەكوژرێیت ئەوا هەر دەمریت و گەر بژێیت بە سەربەرزی دەژێیت) ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : ورەی زۆر بەرز كردمەوە[١٩٦] ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : كەسم نەبینیوە وەكو( محمدی كوڕی نوح) لە تەمەندا زۆر گەورە نەبوو و عیلمێكی كەمی پێ بوو كەچی زۆر سوور بوو لە سەردینەكەی ، جارێكیان دوو بە دوو بووین پێی فەرمووم : ئەی باوكی عبدالله ، الله الله تۆ وەك من نیت تۆ كەسێكیت خەڵكی چاوت لێ دەكەن و شوێنت دەكەون ، لە خوا بترسە لە سەر قسەی خۆت سوور بە و خۆراگر بە .ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : زۆر سەرسام بووم لە ئامۆژگارییە بە نرخەكەی[**] .

پاشان (مأمون) بە نوسراوێك( اسحاق)ی ئاگادار كردەوە كە ئەو خەڵكەی ناچار بوونە كاتێ رازی بوون و ئەو ئایەتەیان كرووەتەبەڵگە كە دەفەرموێت ﴿إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ﴾ بەڵام ئەوانەهەڵەن و دەبێ هەموویان رەوانە بكرێن بۆ طرسوس ، ئەوانیش بە رێ خران .

كاتێ ئیمامی ئەحمەد و هەموو ئەو خەڵكە لە سەربازگەی (مأمون) نزیك بوونەوە خزمەتكارێك لە خزمەتكارەكانی (مأمون) هات بۆ لایان بە چمكی كراسەكەی فرمێسكی دەسری و فەرمووی : ئەی باوكی عبدالله (مأمون) شیر (شمشێر)ێكی دەرهێناوە تاكو ئێستا دەرنەهێنراوە و سوێندی خواردووە گەر وەڵامی نەدەیتەوە كە قورئان دروست كراوە ئەوا دەتكوژێت .

ئەمجار ئیمامی ئەحمەد هەردوو ئەژنۆی خۆی خستە سەر گڵەكەو سەری بەرز كردەوە بۆ ئاسمان وفەرمووی:﴿ گەورەم خودایە،، حیلم و میهرەبانی وبەزەییت ئەو فاجرەی لە خۆبایی كردووە تاكو جورئەت بكات

---

(١٩٦) البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٧٨ ) ،المناقب:( ٣١٣) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٩٢/٧) .

** سير أعلام النبلاء (٤٩٣/٧) .

خۆشەویستەکانی تۆ دەکوژێت ، خودایە ئەگەر قورئان کەلامی تۆیەو دروست کراو نییە لە کۆڵمانی بکەرەوە﴾[١٩٧] کاتێ لە خەیمەکەی (مأمون) نزیك بوونەوە لە نیوە شەودا کابرایەك خۆی کرد بە ژووردا وفەرمووی: موژدە وا (مأمون) کۆچی دوایی کرد[١٩٨]. خوای گەورە دوعای ئیمامی ئەحمەدی قبولێ کرد و نە (مأمون) ئەوانی بینی وەنە ئەمان (مأمون) یان بینی .وە ئەمجار ئیمامی ئەحمەد و محمدی کوڕی نوح گەڕانەوە بۆ بەغدا ، لە گەڕانەوەدا لە ساڵی ٢١٨ ك (محمدی کوڕی نوح) کۆچی دوایی کرد و ئیمامی ئەحمەد نوێژی لە سەر کرد** .

لەو کاتەدا کە ئیمامی ئەحمەد بەند کرابوو خەڵکی دەهاتن بۆ لای وباسی ئەوەیان بۆ دەکرد کە (توقیە) بکات واتە شتێك بڵێت و بە دڵ مەبەستی نەبێت . ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : جا چ لەو فەرمودەیە دەکەن کە دەڵێت : (ئیماندارى وابوو پێش ئێوە بە منشار دەیان کردە دوو لەتەوە کەچی وازی لە دینەکەی خۆی نەدەهێنا ) من لە بەند ناترسم لە گەڵ ماڵی خۆمدا وەکو یەکە و لە کوشتن ناترسم بەڵام لەوە دەترسم لە کاتی ئازاردانمدا بە قامچی خۆڕاگر نەبم[١٩٩] جا بۆیە هەموو کاتێ لە خوای باڵادەست دەپاڕایەوە بۆ ئەوەی ئارامی پێ ببەخشێت ، ئیمامی ئەحمەد بۆ هەموو سجنەکان بەرنوێژی دەکرد و خەڵکی لە ناو بەندینخانەو لە دەرەوەش دوعایان بۆ دەکرد .

کاتێ (مأمون) کۆچی دوایی کرد دوو وەسێتی بە جێ هێشت یەکەمیان ئەوە بوو کە داوای لە (معتصم) ی برای کرد پاش خۆی خەڵکی تاقیبکاتەوە و لە سەر پەیڕەو و بەرنامەکەی ئەو بڕوات ، وەدووەمیان ئەوە بوو کە زیاتر بایەخ

---

[١٩٧] البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٧٨).

[١٩٨] المناقب:( ٣١٤) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٩٢/٧) .

** سير اعلام النبلاء(٤٩٣/٧).

[١٩٩] المناقب:( ٣١٦) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٩١/٧-٤٩٢) .

بدات بە( احمد بن ابي دؤاد) و بيكات بە وەزيرى خۆى و پشتى پىٚ ببەستيٚت چونكە (ابن ابي دؤاد) زياتر بايەخى دەدا بە كيٚشەكەو (معتصم) پياويٚك نەبوو خەريكى عيلم و زانيارى بيٚت بەلٚكو خەريكى شەرٍ و غەزا كردن بوو بۆيە هەموو كيٚشەكەى خستە ئەستۆى (ابن ابي دؤاد) .[٢٠٠]

## لە بەر دەستى ( معتصم ) دا[٢٠١]

كاتىٚ كە (مأمون) كۆچى دوايى كرد ئيمامى ئەحمەديان گەرٍانەوە بۆ بەغدا پاشان معتصم بوو بە خەليفەى موسلٚمانان كەچى ديسان( احمد بن ابي دؤاد) بوو بە (قاضي القضاة) و يەكيٚك لە پياوە نزيكەكانى (معتصم)* لە رەمەزانى سالٚى ٢١٩ ك دا ئيمامى ئەحمەد بە بەند كراوى برا بۆ مالٚى (اسحاق بن ابراهيم) كە بەر پرسى پۆليسى بەغدا بوو لەوىٚ بەند كرا و هەموو رۆژيٚك دوو كەسيان بۆ لاى ئيمامى ئەحمەد دەنارد بە مەبەستى گفتوگۆ كردن يەكيٚكيان (احمد بن رياح) و ئەويدى (ابو شعيب الحجاج )بوو وتوويٚژيٚكى زۆريان لە گەلٚدا دەكرد پاشان ئەگەر بيانويستايە برٍۆن ئەوا دەيانگوت (قيد) يٚكى دى بۆ زياد كەن ، قەيدەكانى پيٚى گەيشتە چوار دانە لە يەكيٚك لە وتوويٚژەكاندا ئيمامى ئەحمەد بە يەكيٚكيانى فەرموو: چ دەلٚيٚيت دەربارەى عيلمى خوا ؟ فەرمووى : عيلمى خوا دروست كراوە . ئيمامى ئەحمەد فەرمووى: ئەوا كوفرت كرد . كابرايەك بە تەنيشتيانەوە بوو فەرمووى : ئەى نازانى ئەمە نيٚردراوى خەليفەى موسلٚمانانە ؟فەرمووى: بەلٚى بەلاٚم ئەو كوفرى كرد .

بەم چەشنە ئيمامى ئەحمەد خواى لىٚ رازى بيٚت بيست و هەشت مانگ لە زيندانىدا مايەوە لەو ماوەيەدا ئەو نويٚژى بۆ سجنەكان دەكرد ، پاشان بانگ

---

[٢٠٠] ابن حنبل:( ٦٥).

[٢٠١] البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٧٩ – ٢٨١) ،المناقب:( ٣١٩–٣٤٨) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٩٤،٥٠٤/٧) .

* المناقب : ( ٣١٩ ،٣٤٨) ، البداية والنهاية : ( ٢٧٩–٢٨١) .

كرا بۆ لاى خەليفە پێيان فەرموو: ئەگەر وەڵامى خەليفە نەدەيتەوە ئەوا دەتخاتە جێگايەكەوە هەرگيز رۆژ بە چاو نابينى ، پاشان برا بۆ بەندينخانە و سبەينىٚ برديان بۆ لاى خەليفە هەموو كۆت و كەلەپچەو ئاسنەكانى هەڵگرد و چووە ژوورەوە بۆ لاى خەليفە بينى وا خەليفە و (احمد بن ابي دؤاد) و كۆمەڵێك لە زانايانى موعتەزيلە دانيشتوون[٢٠٢]. بە مەبەستى ترساندنى ئيمامى ئەحمەد بينى وا دوو كەس بە كوژراوى لە ژوورەكەدا فرىٚ دراون بەڵام ئيمامى ئەحمەد بايەخى پىٚ نەدا كەچى لەو كاتەدا رووى كردە (ابو عبد الرحمن الشافعي) كەلەوى دانيشتبوو فەرمووى: چى شتێك دەزانى دەربارەى (مەسح لە سەر خوف) لە (ئيمامى شافعى)يەوە ؟ ابن ابي دؤاد فەرمووى :تەماشا كەن ئەو كابرايە بانگ كراوە بۆ ئەوەى بدرىٚ لە ملى، كەچى ئەو باسى فيقه دەكات[٢٠٣].

كاتىٚ (المعتصم) ئيمامى ئەحمەدى بينى فەرمووى: وەرە پێشەوە ، ئەويش پێش كەوت فەرمووى: دانيشە ، ئيمامى ئەحمەد دانيشت ، كەمێك بىٚ دەنگ بوون ئيمامى ئەحمەد فەرمووى: رێگام دەدەى قسە بكەم ، معتصم فەرمووى : بەڵىٚ ، ئيمامى ئەحمەد فەرمووى: ئەى پێشەواى ئيمانداران ئايە پێغەمبەرى ئامۆزات (ﷺ) بۆ چ شتێك بانگەوازى خەڵكى كرد ؟ معتصم فەرمووى: بۆ ئەوەى خەڵكى شايەتمان بهێنن و بڵێن (لا إلـــهَ الاَّ الله) ئيمامى ئەحمەد فەرمووى : من شايەتى دەدەم كە (لا إلـــهَ الاَّ الله) . ئيمامى ئەحمەد چەند بەڵگەيەكى بۆ هێنانەوە كە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) بانگەوازى خەڵكى كردووە بۆ (لا إلـــهَ الاَّ الله) وە ئەگەر كىٚ ئەوە بڵێت چيتر خوێنى حەرام دەبێت لە سەر موسڵمانان . ئەمجار (ابن ابي دؤاد) چەند قسەيەكى كرد بەڵام ئيمامى ئەحمەد وەڵامى نەدەدايەوە چونكە لە قسەكانى تێنەدەگەيشت . (معتصم) فەرمووى: بۆ وەڵامى

---

[٢٠٢] المناقب:( ٣١٩).

[٢٠٣] الطبقات:( ٩٦) ،المناقب:( ٣٢٠ ) ، ابن حنبل:( ٩٦) ،حلية الاولياء:( ٩ :١٨٦).

نادەیتەوە ؟ ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: بە کەسێکی ئەهلی عیلمی نازانم تاکو قسەی لە گەڵدا بکەم . ئەمجار معتصم فەرمووی: ئەگەر کەسێکی پێش من تۆی بەند نەکردبایە ئێستا من تۆم نەدەگرد. ئەی عبدالرحمن فەرمانم پێ نەکردیت کە ئەم کێشەیە کۆتایی پێ بهێنی ؟ ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : الله اکبر ئەمە دەرگایەکە لە موسڵمانان دەکرێتەوە ، ئەمجار معتصم فەرمووی : عبد الرحمن گفتو گۆی لە گەڵدا بکە . عبدالرحمن فەرمووی: چی دەڵێیت دەربارەی قورئان ؟ ئیمامی ئەحمەد وەڵامی نەدایەوە ، معتصم فەرمووی: وەڵامی بدەرەوە ، ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: چی دەڵێیت دەربارەی عیلم ؟ عبدالرحمن بێ دەنگ بوو ، ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : قورئانی پیرۆز لە عیلمی خوایە ، وە کێ بڵێت عیلمی خوا دروست کراوە ئەوا کوفری کردووە ، عبد الرحمن بێ دەنگ بوو ، بەڵام لە ناو خۆیاندا فەرموویان : ئەی پێشەوای ئیمانداران تۆ و ئێمەی کافر کرد ، بەڵام معتصم گوێی پێ نەدان عبد الرحمن فەرمووی : خودا بوو بەڵام قورئان نەبوو . ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: ئایە خودا بوو عیلم نەبوو ؟ عبد الرحمن بێ دەنگ بوو ، ئەمجار لە ناو خۆیاندا دەستیان بە مقۆ مقۆ کرد ، ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : ئەی پێشەوای ئیمانداران بەڵگەیەکم لە قورئان یا فەرموودەکان بۆ بهێنەوە تاکو منیش شوێنتان بکەوم ، (ابن ابي دؤاد) فەرمووی : بۆ تۆ تەنها شوێنی ئەو دوو شتە دەکەویت ؟ ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: ئیسلام لە سەر ئەو دوو شتە بەندە ، ئەمجار گفتوگۆیەکی زۆر کرا بەڵام نەیانتوانی ئیمامی ئەحمەد ببەزێنن ، ابن ابي دؤاد فەرمووی : ئەی پێشەوای ئیمانداران واللە ئەم کابرایە گومڕایە و بانگی خەڵکی دەکات بۆ گومڕایی و بیدعە ئەمانەش هەموو فەقیهەکان وقازێکانی تۆن پرسیاریان لێ بکە ، ئەویش فەرمووی : چ دەڵێن ؟ ئەوانیش هەموو قسەکەی ئەویان کرد .

ئەمجار لە رۆژی دووەم وسێیەم بانگیان کرد بەڵام پشت بە خوا هەموو رۆژێك ئیمامی ئەحمەد سەردەكەوت بە سەریاندا گەر بێ دەنگ بوونایە ابن ابي دؤاد دەستی دەكرد بە قسە كردن لە بەر ئەوەی بێ دەنگ نەبن كەچی لە هەموویان جاهیل ترو نەفام تر بوو . وەشتی زۆریان باس دە كرد ئیمامی ئەحمەد دەیفەرموو: تاكو ئێستا شتی وام نەبیستووە ، ابن غوث كە یەكێك بوو لە زانایانی موعتەزیلە دەستی بە قسە كردن كرد و زۆری گوت و درێژەی پێدا ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : من نازانم تۆ چی دەڵێیت بەڵام هەر ئەوەندە دەزانم كە ( إنَّ اللهَ أحدٌ صمدٌ ليس كمثله شيء) ئەویش بێ دەنگ بوو ئەمجار باسی بینینی خوای گەورەیان كرد لە قیامەتدا و ویستیان سەنەدی فەرموودەكە زەعیف بكەن بەڵام بەڵگەكانی ئیمامی ئەحمەد زۆر لەوە زیاتر بوو كە ئەوان لە مێشكی خۆیاندا دایان نابوو .

لە گەڵ ئەم هەموو قسانەدا معتصم بە زبانی خۆش لە گەڵ ئیمامی ئەحمەد دا قسەی دەكرد و دەیفەرموو: ئیمامی ئەحمەد وەڵامم بدەرەوە تاكو بتكەم بە نزیك ترین كەسی خۆم وە كەسێك كە هەموو شتێك بە دەستی ئەو بێت ، ئیمامی ئەحمەد : دەیفەرموو : یەك ئایەت یا یەك فەرموودەم بو بهێننەوە تاكو وەڵامتان بدەمەوە .

لە كاتی ئەو هەموو قسانەدا ئیمامی ئەحمەد بەڵگەی بۆ ئەوان دەهێنایەوە كەچی ئەوان دەیانگوت : ئەی پێشەوای ئیمانداران ئەم كابرایە گومڕایە و خەڵكی بانگ دەكات بۆ گومڕایی . كاتێ بینیان قسە كردن لە گەڵیدا هیچ سوودی نییە فەرموویان :ئەی پێشەوای ئیمانداران جوان نییە بۆ تۆ ئەم كابرایە ئازادكەیت و دوو خەلیفە ببەزێنێت ، لەم كاتەدا معتصم پەست بوو بە ئیمامی ئەحمەدی فەرموو : لەعنەتی خوات لێ بێت حەزم كرد وەڵامم بدەیتەوە كەچی وەڵامت نەدامەوە ، بیبەن بۆ بەندیخانەو ئازاری بدەن ، ئەوانیش

دەستیان کرد بە لێدانی ئیمامی ئەحمەد و چەند تەڵێك لە قژی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە ئیمامی ئەحمەد پێی بوو لێیان سەند، ئەمجار ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : ئەی پێشەوای ئیمانداران پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت : ((لا يحل دم امرئ مسلم يشهد ان لا اله الا الله الا باحدى الثلاث)) وەدەفەرمووێت : ((أُمرت أنْ أقاتل الناس حتى يقولوا لا اله الا الله فاذا قالوها عصموا مني دماءهم واموالهم)) ئەی بە چ شتێك خوێنی من حەڵاڵ دەکەیت ، ئەی پێشەوای ئیمانداران بیر بکەرەوە وەستانت لە بەر دەستی خوادا وەکو وەستانم لە بەر دەستتدا ، لێرەدا معتصم سارد بووەوە بەڵام هێندە فەرموویان : ئەمە گومڕایەو خەڵکی بانگ دەکات بۆ گومڕایی ، دیسان معتصم فەرمانی کرد بە لێدانی ئیمامی ئەحمەد، ئەوانیش دەستیان کردەوە بە لێدانی . معتصم دەیفەرموو : توند توند لێیدەن خوا دەستتان ببڕێت .

کاتێ قامچی یەکەمی لێدرا ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: (بسم الله) وە کاتێ دووەمیان لێدا فەرمووی: (لا حول ولا قوة الا بالله) وەلە سێیەمدا فەرمووی : (قورئان کەلامی خوایە و دروستکراو نییە) ، وەلە چوارەمدا فەرمووی : ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللّهُ لَنَا﴾ ، تاکو بیست ونۆ قامچی لێدرا . هێندە بە توندی لێیان دەدا کە هیچ کەسێك نەیدەتوانی بەرگەی بگرێت ئەوەتا (شاباص التائب ) کە یەکێك بوو لەوانەی کە ئازاری ئیمامی ئەحمەدی دەدا پاشان تەوبەی کردبوو دەڵێت :(هەشتا قامچیم دا لە ئیمامی ئەحمەد ئەگەر بدرایە لە فیل راست نەدەبووەوە) پاشان چەند جارێك معتصم داوای لێ کرد کە وەڵامی بداتەوە کەچی وەڵامی نەدەدایەوە ، وەچەند جارێك ئیمامی ئەحمەد لە بەر دەستیاندا دەبورایەوە ، دواجار کە بورایەوە کاتێ بە خەبەر هاتەوە بینی لە ژوورێکدایەو دەست وپێی کراوەتەوە ،ئەمە لە بیست و پێنجی رەمەزانی ساڵی ٢٢١ ك ئەمجار

خەليفە فەرمانى كرد كە بچێتەوە ماڵى خۆيان چونكە بە كەڵكى ئەوە نەدەهات چيتر لە بەندينخانەدا بمێنێتەوە .

(المروزي) دەڵێت : كاتىَ ئيمامى ئەحمەد لە بەندينخانە بوو چووم بۆ سەردانى و ووتم : ئەى باوكى عبدالله خواى گەورە لە قورئانى پيرۆزدا دەفەرمووێت : ﴿وَلا تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ﴾ ئيمامى ئەحمەد وەڵامى دايەوە و فەرمووى: بچۆ دەرەوە بزانە چى دەبينيت؟، المروزى دەڵێت : كاتىَ چوومە دەرەوە خەڵكێكى زۆرم بينى دانيشتوون كاغەز وپێنوسيان بە دەستەوەيە .ووتم : ئێوە چ دەكەن وا لێرە دانيشتوون ؟فەرموويان: چاوەروانى (ئيمامى ئەحمەد)ين چ وەڵامێك دەداتەوە تاكو بينوسين ، منيش بە ئيمامى ئەحمەدم گوت ، ئيمامى ئەحمەد فەرمووى : خۆم دەكوژم بەڵام ئەو خەڵكە گومڕا ناكەم و لە رىَ لايان نادەم . ئەو هەموو ئازار و ئەشكەنجەيەى ئيمامى ئەحمەد هيچ لە بير وباوەڕى نەهێنايە خوارەوە سەربازەكان ناچار بوون رێگايەكى دى بگرنە بەر ئەويش ئەوەبوو كە يەكێك لە سەربازەكان بە معتصم ى گوت : ئەى خەليفەى موسڵمانان رێگام بدەن با بيكوژم . ابن ابي دؤاد فەرمووى : نەخێر گەر لێرە بيكوژن ئەوا لە ناو خەڵكيدا رێزى زياد دەكات و خەڵكى زياتر شوێنى دەكەوێت بۆيە ابن ابي دؤاد چەند كەسێكى بانگ كرد و كردنى بە شايەت كەوا ئيمامى ئەحمەد بە سەلامەتى چووەتە دەرەوە .

كاتىَ ئيمامى ئەحمەد گەڕايەوە ماڵەوە پزيشك سەردانى كرد و چەند پارچە گۆشتێكى مردووى لە لەشى بڕى و فڕەى دا و دەستى بە تەداوى كردنى كرد . وەهەموو ساتێك هەواڵى دەگەيشتە لاى معتصم چونكە معتصم پەشيمان بووەوە لە ئازاردانى ئيمامى ئەحمەد و حەزى دەكرد زوو چاك ببێتەوە و كاتىَ چاك بووەوە معتصم و هەموو موسڵمانان خۆشحاڵ بوون ، ئيمامى ئەحمەد گەردنى هەموو ئەو كەسانەى ئازاد كرد كە ئازاريان دابوو تەنانەت (معتصم) يش

و هەمیشە دەیفەرموو: چ سوودێك وەردەگریت گەر براکەت بە هۆی تۆوە ئازار بدرێت ، لە رۆژی قیامەتدا بانگ دەکرێت : ئەوانەی کە پاداشتیان لە سەر خوایە با هەستن بۆیە کەس هەڵناسێت تەنها ئەوانە نەبێت کە لێبوردە بوونە .

کاتێ ئازاد کرا چەندین موسڵمان و زانای موسڵمانان سەردانیان کرد وەك (يعقوب بن ابراهيم الزهري) و( سليمان بن داود) و نێو چاوانی ئیمامی ئەحمەدیان ماچ کرد ، ئیمامی ئەحمەد پێی ناخۆش بوو کە( اسحاق بن راهویه) ئازار بکێشێت و بێت سەردانی بکات بۆیە ئیمامی ئەحمەد بڕیاری دا کە ئەم بچێت بۆ سەردانی لە شاری( الری) هەرچەندە لەوەو پێش یەکتریان نەبینی بوو بەڵام ناوی یەکتریان بیستبوو وە یەکتریان خۆش دەویست ، کاتێ ئیمامی ئەحمەد گەیشتە شاری(الری) چووە یەکێك لە مزگەوتەکان بارانێکی زۆر دەباری و بایەکی بەهێز هەڵی کردبوو وەکاتەکەش شەوێکی زۆر تاریك بوو بە ئیمامی ئەحمەدیان فەرموو : دەمانەوێت مزگەوتەکە دابخەین بچۆ دەرەوە ئەویش فەرمووی: ئەمە مزگەوتی خوایە ومنیش بەندەی خوام فەرموویان :دەردەچیت یا بە زۆر دەرت کەین ؟ ئیمامی ئەحمەدیش فەرمووی: سلاما .. .. چووە دەرەوە بەڵام باران و تاریکی شەو زۆر بێ تاقەتی کردبوو و نەیدەزانی بەو شەوە بۆ کوێ بچێت لە ناکاو کابرایەکی بینی لە ماڵێکەوە هاتە دەرەوە وفەرمووی : بۆ کوێ دەڕۆیت لەم کاتە ناوەختەدا ؟ ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: نازانم . ئەویش فەرمووی: فەرموو وەرە ژوورەوە،ئیمامی ئەحمەدیش چووە ژوورەوە و جلوبەرگەکەی لە بەر داکەند و نانی خوارد لە گەڵیاندا پاشان کابرا پرسی : خەڵکی کوێیت؟ ئیمامی ئەحمەد فەرمووی :خەڵکی بەغدام .کابرا فەرمووی: ئایە ( ئیمامی ئەحمەد ی کوڕی حەنبەل) دەناسیت؟ ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : من (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)م ،ئەویش فەرمووی :منیش( إسحاق بن راهویه) م *

* المناقب :( ٣٨٠) .

ئيمامى (الذهبي) دەڵێت: ئەم چيرۆكە كە (ابن الجوزى) باسى كردووە، چيرۆكێكى هەڵبەستراوە** .

لە ساڵى٢٢٧ ك كە پێشەوا لە بەنديخانە ئازاد كرا دەستى كردەوە بە گێڕانەوەى فەرموودە كەچى( الحسن بن على بن الجعد) كە قازى بەغدا بوو نامەيەكى ئاگادار كردنەوەى بۆ( ابن ابي دؤاد) نارد كەوا ئيمامى ئەحمەد دەستى كردووەتەوە بە گێڕانەوەى فەرموودە بۆيە ئيمامى ئەحمەد وازى لە گێڕانەوەى فەرموودە هێنا.

## ئەوانەى كە لە تاقيكردنەوەكەدا خۆ ڕاگربوون

چەند كەسێك لە كاتى تاقيكردنەوەكەدا خۆڕاگر بوون و مل كەچى قسەكانى خەليفەو( ابن ابي دؤاد) نەبوون و دەيانفەرموو : قورئان كەلامى خوايەو دروست كراو نىيە . جا هەندێكيان كوژران و هەندێكيان لە زيندانەكاندا كۆچى دواييان كرد لەوانە:

١ ـ ئەحمەدى كوڕى نصر ى الخوزاعى: لە سەردەمى (واثق)دا تاقيكرايەوە و وەڵامى نەدايەوە ، بۆيە فەرمانيان كرد كە بكوژرێت و سەرى لە لاشەى بكرێتەوە و لە سامەرا لە سێ دارە دراو سەرى لە بەغدا هەڵواسرا و پاش شەش ساڵ سەر و لاشەكەى كۆ كرايەوە و لە بەغدا نێژرا واتە ساڵى ٢٣٧ ك .(٢٠٤)

٢ ـ محمدى كوڕى نوح.

٣ ـنعيم ى كوڕى حماد(٢٠٥): لە ساڵى ٢٢٨ ك لە لە بەندينخانەدا لە سامەرا كۆچى دوايى كرد ، ابن ابي دؤاد فەرمانى دا كە كفن نەكرێت و نوێژى لە سەر نەكرێت .

---

** .(سير أعلام النبلاء: ٥٣٦/٧) .

(٢٠٤) المناقب:( ٣٩٨) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٤٨/٧) .

(٢٠٥) ابن حنبل:( ٦٦ ) ، المناقب:( ٣٩٧).

٤ ـ ابو نعيم الفضل ى كورِى دكين[٢٠٦] .

٥– عبد الاعلى ى كورِى مسهر الدمشقي[٢٠٧]: له سالّى ٢١٨ ك له بەندينخانەدا له بەغدا كۆچى دوايى كرد .

٦– عفان ى كورِى موسليم[٢٠٨] .

٧– ابو يعقوب يوسف ى كورِى يحيى البويطي[٢٠٩] :له سالّى ٢٣٢ ك له بەندينخانەدا له بەغدا كۆچى دواى كرد كۆت و كەلەپچەى له دەستدا بوو.

٨–اسماعيل ى كورِى ابى اويس .

٩–ابو مصعب المدنيان .

١٠–يحيى الحماى.

١١–الحارث كورِى مسكين ابو عمر الضبي[٢١٠] .

## ئيمامى ئەحمەد و واثق باللە

پاش كۆتايى هێنانى هەشت سالّ و هەشت مانگ بە سەر خيلافەتى معتصم دا معتصم كۆچى دوايى كرد و واثق باللە بوو بە خەليفەى موسلّمانان بۆيە ئيمامى ئەحمەد لە سەردەمى ئەمدا خۆى دەشاردەوەو زۆر خۆى دەرنەدەخست وە هەموو سێ رۆژ جارێك جێگاكەى خۆى دەگۆرِى چونكە واثق لە سەرەتاى خيلافەتى دا خەلّكى تاقيدەكردەوە پاشان وازى هێنا چونكە جارێكيان لە پێش واثق دا گفتو گۆيەكى درێژ كرا لە نێوان(احمد بن ابي دؤاد) و پيره مێردێكدا لە كۆتاييدا پيرەمێردەكە سەر كەوت بە سەريدا و( ابن ابي دؤاد) هيچ بەلّگەيەكى پێ نەما بۆيە لەوە بە دواوە بە هيچ شێوەيەك واثق باسى

---

[٢٠٦] المناقب:( ٣٩٥).

[٢٠٧] المناقب:( ٤٠١).

[٢٠٨] المناقب:( ٣٩٤).

[٢٠٩] المناقب:( ٣٩٧ ) ، ابن حنبل:( ٦٦).

[٢١٠] المناقب:( ٤٠٠).

نەدەکرد و خەڵکی تاقی نەدەکردەوە خۆیشی لەو قسەیە گەڕایەوەو تەوبەی کرد.[٢١٢]

## دەرچوون لە دژی سوڵتان

حەنبەل ی کوڕی اسحاق دەفەرمووێت :(لە سەردەمی (واثق بالله) دا فەقیهەکانی بەغدا کۆ بوونەوە و چوون بۆ لای ئیمامی ئەحمەد لەوانە ( ابوبکر بن عبید و ابراهیم بن علي المطبخي و فضل بن عاصم ) بە ئیمامی ئەحمەدیان فەرموو:– (( ئەی باوکی عبدالله ئەم کار و قسەیە بڵاوبووەوە( واتە بڵاو بوونەوەی قسەی کە قورئان دروستکراوەو چەند شتێکی تر ) باوکی عبدالله فەرمووی :– چیتان دەوێت ؟ فەرموویان :– هاتووین راوێژت لە گەڵدا بکەین کە ئێمە رازی نین بە ئەمارەت و خیلافەت و سوڵتانی ئەو ( واتە: واثق بالله ) . بۆیە ئیمامی ئەحمەد دەستی کرد بە تێڕاوانین لە گەڵ ئەواندا پاشان فەرمووی :– دەبێ بە دڵ ئینکاری لێ بکەن بەڵام نابێت دەستی گوێڕایەڵی لێ ببچرن و یەکریزی موسڵمانان تێك مەدەن و خوێنی خۆتان و خوێنی موسڵمانان مەرێژن و تەماشای ئەنجامی کارەکەتان بکەن و ئارام بگرن تاکو چاکەکار دەکەوێتە ئیسراحەتەوە و خراپەکاریش خەڵکی لێی دەکەوێتە ئیسراحەتەوە، وە وتووێژێکی زۆر لە نێوانیاندا روویدا کە من لە بیرم نەماوە ، ئەمجار ئەوان رۆیشتن ، من و باوکم چووینە ژوورەوە بۆ لای ئیمامی ئەحمەد باوکم فەرمووی :– داوا دەکەین لە خوا کە ئێمە و ئوممەتی محمد (ﷺ) سەلامەت بکات وە من حەز ناکەم هیچ کەسێك ئەو کارە بکات ،ئەی باوکی عبدالله ئایە ئەم کارە بە لای تۆوە راستە ؟ ( واتە دەرچوون دژی سوڵتان ) فەرمووی :– نەخێر ئەمە دژی ئەو فەرموودانەن کە فەرمانی پێ کردووین بە ئارامگرتن ، ئەمجار باوکی عبدالله

---

[٢١٢] ابن حنبل:( ٦٧ )، المناقب:( ٣٤٨، ٣٥٦) ، سير أعلام النبلاء :( ٥٠٤/٧، ٥٠٥) .

فەرمووى ئەوەتا پێغەمبەرى خوا (ﷺ ) فەرموويەتى :– (( ئەگەر ئازار ى تۆى دا (واتە سوڵتان) ئەوا ئارام بگرە و ئەگەر ....ئەگەر ....... ئارام بگرە )) *
تەماشاى ئەو هەڵوێستە بكەن بە راستى شوێنكەوتنى فەرموودەكانى پێغەمبەر (ﷺ ) بەو شێوە دەبێت و زانايان و موسڵمانى شوێكەوتەى پێغەمبەر(ﷺ ) دەبێ وابن ، لە كاتى وەرگرتنى هەڵوێستێك بیر لە تۆڵە سەندنەوە ناكاتەوە و بە ئارەزووى خۆى فەتوا بدات بەڵكو دەبێ شوێن كەوتەى شەرعى خوا بێت نەك هەواو ئارەزووەكانى ئەوەتا لەو كات و ساتەدا كە ئیمامى ئەحمەد ئازار دەدرا ، لێدەدرا ، بەند دەكرا ، كەچى ئەو رازى نابێت بە دەرچوون دژى سوڵتان و ئەو هەڵوێستەى سوڵتان بەرانبەر بە ئەو هیچ لە قسەكانى ئیمامى ئەحمەدى نەدەگۆرى ، تەماشاى حاڵى خۆى نەدەكرد بەڵكو تەماشاى شەرعى دەكرد ، ئايە شەرع بە چى شتێك فەرمان دەكات ئەگەر هاتوو سوڵتانێكى موسڵمان هەرچەندە فاسق و فاجر بێت ئازارى داین ؟؟ وە بە چى شتێك فەرمان دەكات ئەگەر كافرێك پارەو پولى پێ داین و رێزى لێ گرتین ؟؟؟ ئیمامى ئەحمەد نەوەك لە گەڵ ئەوەدا نەبوو كە دژى سوڵتان دەرچن بەڵكو هانى موسڵمانانى دەدا كە دژى نەيارانى سوڵتان بجەنگن ، ئەوانەى كە لە فەرمانى سوڵتان دەرچوون ( الخوارج ) بەڵگەمان لە سەر ئەوە ئەوەيە كە لەو كاتەدا ( بابەك الخرمى ) دژى دەوڵەتى عەباسييەكان دەرچوو ئیمامى ئەحمەد هانى موسڵمانانى دەدا و نوسراوى بۆ شارەكان دەنارد كە دژى بابەك جیهاد بكەن ، وە ئاشكرايشە كە ( بابەك ) لە سەردەمى ( معتصم ) و ( مأمون ) دا دەرچوو كە ئەو دوو خەليفەيە زۆر ئازارى ئیمامى ئەحمەديان داو ماوەيەكى زۆر بەنديان كرد ، ** بۆمان دەردەكەوێت كە ئاينى پیرۆزى ئیسلام دژى دەرچوونە بە گژ سوڵتانى

---

* رواه الخلال في السنة: ( ٩٠ ).

** رواه الخلال في السنة : (١١٥ –١١٩).

موسڵماندا و هانی خەڵکی دەدات کە ئارام بگرن و فەرمان بە چاکە بکەن و نەهی بکەن لە خراپە تەنانەت ئیمامی ئەحمەد وا دەبینێ کە دژایەتی کردنی ( الخوارج) چاکترە لە دژایەتی کردنی کافر ، کابرایەك پرسیار لە ئیمامی ئەحمەد دەکات ئەگەر کەسێك ویستی بچێت بۆ غەزا ، ئایە بۆ کام بەرە بچێت باشترە ؟ (واتە بەرەی کافرەکان یان بەرەی بابەك الخرمی ) ئیمامی ئەحمەد فەرمووی :ـ بەرەو ئەو شارە بچێت .. ئەمجار دەستی درێژ کرد بۆ لای بابەك الخرمی ***.

## وتەی زانایان دەربارەی ئیمامی ئەحمەد پاش تاقیکردنەوەکە

(علي بن المديني) دەڵێت : ئەوەی ئیمامی ئەحمەد کردی بۆ ئەم دینە کەس نەیکردووە (المیمونی) دەڵێت : زۆر سەر سام بووم لەم قسەیە چووم بۆ لای (ابی عبید القاسم بن سلام) پێم گوت : کە (علی بن المدینی) وادەڵێت! . فەرمووی: راست دەکات چونکە ابو بکر لە رۆژی ڕدەدا هاوڕێ و هاوەڵ و یارمەتی دەری هەبوو بەڵام ئیمامی ئەحمەد هاوڕێ و یارمەتی دەری نەبوو ، ئەمجار (ابو عبید) زۆر مەدحی ئیمامی ئەحمەدی کرد و فەرمووی : لە ئیسلامدا کەس ناناسم وەك ئیمامی ئەحمەد[٢١٣] .

هەروەها (علي بن المديني) لە جێگایەکی تر دا دەڵێت : خوای گەورە ئەم دینەی سەرخست بە دوو کەس سێیەمیان نی‌یە یەکەمیان ابو بکر لە رۆژی (الردة)وە دووەمیان ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە رۆژی تاقیکردنەوە[٢١٤] .

*** رواه الخلال في السنة:( ١٢٠).

[٢١٣] البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٨١ ) ، الحديث والمحدثون:( ٣٥١ ) ، المناقب:( ١١١) ،الطبقات:( ١٧) ،تاريخ بغداد : ( ٤١٨/٤) .

[٢١٤] الائمة الاربعة:( ١٨٤ ) ،الطبقات:( ٣ ) ، المناقب:( ١١٠) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٦/٧) ، تاريخ بغداد : (٤١٨/٤)

وەدەڵێت : گەر تووشی بەڵایەك بووم بە شتێك و ئیمامی ئەحمەد فەتوای بۆ دام چیتر گوێی پێ نادەم چۆن دەگەمە خوای خۆم .[٢١٥]

أبو زرعة الرازي دەڵێت : کەسم نەبینیوە وەکو ئیمامی ئەحمەد تێگەیشتوو بێت و ئەوەی ئەو کردی کەس نەیکردووە .[٢١٦]

المزنـي دەڵێت : احمد بن حنبل لە رۆژی تاقیکردنەوە ابو بكر الصديق رۆژی هەڵگەڕانەوە لە دین( الردة) وە عمر رۆژی ( السقيفة) و عثمان بن عفان رۆژی( الدار) وە علي بن ابي طالب رۆژی ( الجمل والصفين)[٢١٧]

(ابو عمر هلال بن المعلي الرقي) دەڵێت :خوای گەورە منەتی کردووەتە سەر ئەم ئوممەتەدا بە چوار کەس یەکەمیان( ابو عبيد) ە کە فەرموودە غەریبەکانی پێغەمبەری(ﷺ )شی کردەوە دووەمیان ئیمامی الشافعي یە کە فیقهی لە فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ )دەرهێناو روونی کردەوە سێیەمیان یحيى بن معين کە ئەو فەرموودانەی بە زاری پێغەمبەرەوە(ﷺ )دانرابوو دیاری کرد چوارەمیان ئیمامی (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)ە لە رۆژی (المحنة)دا خۆڕاگربوو گەر (ئەحمەد) نەبوایە خەڵکی تووشی کوفر دەبوون وەئەگەر ئەو چوار کەسە نەبوایەن ئەوا خەڵکی بە هەلاکەتدا دەچوون[٢١٨]

بشر بن الحارث الحافي دەڵێت : ئیمامی ئەحمەد خرایە ناو کورەوە وەکو ئاڵتونێکی سوور و پاك دەرچوو[٢١٩] ، ئەم قسەیە گەیشتە ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : سوپاس بۆ خودا کە ئەوەی من کردم بشر پێی رازییە[٢٢٠]،

---

(٢١٥) البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٨١).

(٢١٦) البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٨٢ ) ،المناقب:( ١٢٢).

(٢١٧) البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٨١) ،المناقب : (١٢٣) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/ ٤٦٩) .

(٢١٨) البداية والنهاية:( ١٠:٢٨٢ ) ،المناقب:( ١٢٧).

(٢١٩) الحديث والمحدثون:( ٣٥١ ) ،الطبقات:( ١٣ ) ،البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٨١ ) ، علوم الحديث ومصطلحه :(٣٩٤)، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٦/٧) .

(٢٢٠) المناقب:( ١١٧).

وەفەرموويان بە بشر بۆ دەرناچيتە دەرەوە تۆيش وەكو ئيمامى ئەحمەد بكەيت ؟ فەرمووى: دەتانەوێت من وەكو پێغەمبەران بكەم ؟ من ناتوانم ،بەڵام ئيمامى ئەحمەد دەتوانێ[٢٢١] . خوايە بيپاريزيت لە پێشەوە و لە پاشەوە و لە سەرەوە و لە ژێرەوە و لە راستييەوە و لەچەپييەوە[٢٢٢]، ئەو لە هەمووман زاناترەو پێشەوايەكە لە پێشەوايانى موسڵمانان[٢٢٣]، وەكاتێ بە بشر يان فەرموو : تاكو ئێستا ئيمامى ئەحمەد حەڤدە قامچى لێدراوە ئەويش هەردوو پێى خۆى راكشان و تەماشاى كردن و فەرمووى: چەند ناشرينن ئەم دوو پێيە گەر كۆت و زنجيرى پێوە نەبێت بۆ سەرخستنى ئەو پياوە .[٢٢٤]

اسحاق بن راهويه دەڵێت : ئيمامى ئەحمەد حوججەيە لە نێوان خوداو خەڵكيدا ئەگەر ئەو نەبوايە و لە خۆ بوردنى ئەو نەبوايە ئەوا ئيسلام دەڕۆيشت .[٢٢٥] محمد بن مصعب دەڵێت : هەر قامچيەك دەدرا لە ئيمامى ئەحمەد لە بەر خوا لە رۆژەكانى (بشر بن الحارث) باشترە .[٢٢٦]

محمد بن ابراهيم البوسنجي دەڵێت : لاى من ئيمامى ئەحمەد لە سفيان باشترە و فەقيهترە چونكە سفيان تاقينەكرايەوە بەڵام ئيمامى ئەحمەد تاقيكرايەوە ، وەزانيارى سفيان و ئەوانى دى وەكو ئيمامى ئەحمەد نييە چونكە ئيمامى ئەحمەد لە هەموو چاو ساغ ترە ، بشر بن الحارث فەرموويەتى : ئيمامى ئەحمەد كارى پێغەمبەرانى كرد و چوار خەليفە تاقيان كردەوە مأمون و معتصم و واثق بە لێدان و حەپس و ترساندن كەچى هەر لە سەر دينەكەى خۆى خۆڕاگر

---

[٢٢١] المناقب:( ١١٨ ) ، الائمة الاربعة:( ١٨٤) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٦/٧) .
[٢٢٢] الطبقات:( ١٣) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٩٩/٧) .
[٢٢٣] المناقب:(١١٧).
[٢٢٤] المناقب :(١١٩).
[٢٢٥] البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٨١ ) ،الطبقات:( ١٣)المناقب:( ١١٦) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٦/٧) .
[٢٢٦] المناقب:( ١٣٠) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٩/٧) .

بوو ئەمجار المتوكل تاقیكردەوە بە ڕێز لێ گردن و پایە بەرزكردن و هەموو خۆشییەكی دونیای بۆ ئاسان كرد كەچی رووی تێ نەكرد و هەر لە سەردینەكەی خۆی مایەوە بەڵام سفیان بە شێوەیەك لەو شێوانە تاقینەكرایەوە .[٢٢٧]

حجاج بن الشاعر دەڵێت : خوای گەورە منەتی كردووەتە سەر ئەم ئوممەتە بە ئیمامی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل لە سەر قورئان خۆراگر بوو ئەو نەبوایە خەڵكی بە هەلاكەتدا دەچوون ، وەجارێكیان نێو چاوانی ماچ كرد و فەرمووی : خوا پایە بەرزت كات وەكو مالك وسفیان ، سوێند بە خوا پێشەوایەتی ئیمامی ئەحمەد لە هەردوكیان پایە بەرز ترە ، وەهیچ گیان لە لاشەیەكم نەبینیوە لە ئیمامی ئەحمەد باشتر بێت .[٢٢٨]

علي بن شعیب الطوسي دەڵێت : ئیمامی ئەحمەد لای ئێمە نمونەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە (ﷺ) كە دەڵێت : (لە ئوممەتەكانی پێش ئێوە دا كەسی وا هەبوو بە منشار دەیانكردە دوو لەتەوە كەچی لە دینەكەی پاشە گەز نەدەبووەوە) ئەگەر ئیمامی ئەحمەد ئەو كارەی نەكردایە ئەوەشەرمەزارییەكی گەورە بوو بۆ ئێمە لە رۆژی قیامەتدا [٢٢٩]

ابی حاتم دەڵێت : پاش سێ ساڵ لە ئازاد كردنی ئیمامی ئەحمەد لە بەندینخانە چووم بۆ سەردانی بینیم شوێنەواری لێدانەكە بە لاشەیەوە ماوە .

## ئیمامی ئەحمەد و المتوكل*

لە مانگی ذي الحجة ی ساڵی ٢٣٢ ك (المتوكل على الله) كە كوڕی خەلیفە معتصم بوو، بوو بە خەلیفەی موسڵمانان لە تەمەنی بیست وشەش

---

[٢٢٧] المناقب:( ١٣٣ ) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٦٩/٧) .

[٢٢٨] المناقب:( ١٣٥ ).

[٢٢٩] الطبقات :(١٧ ) ، المناقب:( ١٣٦ ) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٧٠/٧) ، تاريخ بغداد : ( ٤١٨/٤) .

* سير أعلام النبلاء :( ٧/ ٥٠٥-٥٧١) .

ساڵيدا[٢٣٠]. لە سەردەمى پێشەواى ئيمانداران المتوكل دا سوننەت و ئەهلى سوننە بووژانەوە و سەركەوتن و بيدعە و ئەهلى بيدعە پشت گوێ خران چيتر بايەخيان پێ نەدەدرا بۆيە موسڵمانان زۆر خۆشحاڵ بوون، ئەم كارەى متوكل بووە مايەى سوپاس گوزارى خەڵكى ،واتە كێشەكە بيست ساڵى خاياند لە ساڵى ٢١٢ك تاكو ٢٣٢ك ، ابراهيم بن محمد التيمى دەڵێت : خەليفەكان سێ دانەن يەكەميان (ابو بكر الصديق)ە كە سەر كەوت بە سەر ئەوانەى لە دين هەڵگەڕابوونەوە ، دووەميان (عمرى كوڕى عبد العزيز)ە كە ئەو دەست بە سەراگردنەى هەندێ لە خەليفە ئەمەوێكان كردبوويان گەڕانييەوە بۆ خاوەنەكانيان ، سێيەميان (المتوكل)ە كە سوننەى ئاشكرا كردوو بيدعەى نەهێشت[٢٣١] تەنانەت دەڵێن پاش كۆچى دوايى المتوكل موسڵمانێك (متوكل) ى بينى بووە خەو فەرموبووى : ئەى متوكل خوا چى لێ كردى ؟ فەرمووى : لە تاوانەكانم خۆش بوو . فەرمووى: بەچى ؟ فەرمووى : بە هەندێ لەو سوننەتانەى كە زيندووم كردەوە[٢٣٢].

جا المتوكل زانايانى ئەهلى سوننەو جەماعەى كۆ كردەوە و پارەيەكى زۆرى پێ دان و فەرمانى پێ كردن كە فەرموودە بگێڕنەوە و رووبەرووى موعتەزيلەو جەهەمييەكان ببنەوە ، بۆيە عثمان بن ابي شيبة لە منصور و ابو بكر بن ابي شيبة لە رەصافە دانيشتن بۆ گێڕانەوەى فەرموودە و هەريەكەيان نزيكەى سى هەزار قوتابى گوێى لێ دەگردن[٢٣٣] ، پاشان متوكل ناردى بە شوێن ئيمامى ئەحمەد دا كە سەردانى بكات و دە هەزار دەرهەمى بۆنارد بە مەبەستى خەرج كردنى لە رێگاو بان دا ئەويش بە صالح ى كوڕى فەرموو : ئەو پارەيە ببە

---

[٢٣٠] المناقب:( ٣٥٦).

[٢٣١] المناقب :(٣٥٦).

[٢٣٢] المناقب:( ٣٥٧).

[٢٣٣] المناقب:( ٣٥٧).

لای خۆت ، ئەو شەوە کە پارەکە لە ماڵیاندا بوو ئیمامی ئەحمەد خەوی لێ نەکەوت، سبەینی هەمووی بە سەر هەژاراندا دابەش کرد و هیچی بۆ خۆی نەبرد هەرچەندە لەوپەڕی دەست کورتی دا بوون* .

لەم کاتەدا خەڵکی ئاژاوەچی و دوو زوبان ویستیان نێوان ئیمامی ئەحمەد و متوکل تێك بدەن بۆیە ئەو هەواڵەیان دەگەیاندە متوکل کە ئەو پارەیەی تۆ بۆت ناردووە هەمووی بە سەر خەڵکیدا دابەش کردووە و خۆی هیچی لێ هەڵنەگردووە ، متوکل خوای گەورە بە بەهەشتی بەرینی شاد بکات فەرمووی : پارەی خۆیەتی چی لێ دەکات ئارەزوی خۆیەتی.(٢٣٤)

وە جارێکیان هەواڵ گەیشتە متوکل کە ئیمامی ئەحمەد لە ماڵەکەیدا چەند (علوی) یەکی شاردووەتەوە بۆیە متوکل بەو شەوە چەند سەربازێکی نارد بۆ ماڵی ئیمامی ئەحمەد و ماڵەکەیان پشکنی کەچی هیچ شتێکیان نەدۆزییەوە بۆیە ئەوانیش بە داوای لێبوردنەوە ئیمامی ئەحمەدیان بە جێ هێشت ، پاشان ئەو کەسەی کە راپۆرتەکەی نوسیبوو کە گوایە (علوی) لە ماڵی ئیمامی ئەحمەد دایە دەست گیر کرا و خەلیفە ئیمامی ئەحمەدی ئاگادار کردەوە کە چی لێ بکەین ؟ ئیمامی ئەحمەدیش فەرمووی : ئازادی بکەن نەوەك دایك و خوشك و منداڵی هەبێ ئێستا دڵیان لایەتی(٢٣٥) .

وەهەندێ کەس بە متوکل یان گوت کە ئیمامی ئەحمەد لەو خواردنەی تۆ بۆی دەنێریت نایخوات و ئەو پارەیەی تۆ بۆی دەنێریت هەمووی دابەش دەکات بەسەر هەژاراندا وە هیچ لەو پارەیە ناخوات ، متوکل فەرمووی : سوێند

---

* سير أعلام النبلاء :( ٥٠٧/٧).

(٢٣٤) المناقب :(٣٦٣).

(٢٣٥) المناقب:( ٣٦٠)، سير أعلام النبلاء :( ٥٠٦/٧) .

بە خوا گەر ئێستا معتصم ی باوكم زیندوو بێتەوە و قسە لە سەر ئیمامی ئەحمەد بكات لێی وەرناگرم .[٢٣٦]

پاشان ئیمامی ئەحمەد چوو بۆ لای متوكل بەڵام پێش ئەوەی بیبینێ جۆرە جلوبەرگێكیان بۆ هێنا كە پیاوە گەورەكانی دەوڵەت لەبەری دەكەن تاكو ئیمامی ئەحمەدیش لە بەری بكات و بچێتە ژوورەوە بۆ لای خەلیفە بەڵام كاتێ لە بەری كرد و چووە ئەو ژوورە تایبەتەی كە بۆیان ئامادە كردبوو بە پەلە جلو بەرگەكەی لە بەر داكەندو دەستی كرد بە گریان و فەرمووی: شەست ساڵە خوای گەورە پاراستومیەتی بەڵام لە دوا ساتەكانی تەمەنمدا تووشی ئەم بەڵایە بووم ، پاشان بە صالحی كوڕی فەرموو: كوڕم ئەم جلوبەرگە بنێرە و بۆ بەغدا و بیفرۆشە و هەموو پارەكەی بە سەر هەژاراندا دابەش بكە .[٢٣٧]

پاشان ئیمامی ئەحمەد داوای كرد لەو ژوورە تایبەتییە دەری بكەن و لە خانویەكی دەرەوەی كۆشكی خیلافەت نیشتەجێ بێت ئەوانیش فەرمانەكەیان جێ بە جێ كرد و خانویەكیان بە كرێ بۆ گرد و چووە ئەوێ پاشان متوكل داوای لێ كرد كە ئەو خانووەی بۆ بكرێت و لەوێ نیشتەجێ بێت بەڵام ئیمامی ئەحمەد رازی نەبوو.[٢٣٨] وە ئەو شازدە رۆژەی كە ئیمامی ئەحمەد لای خەلیفە بوو هیچی نەدەخوارد بەڵكو بەرۆژوو بوو وە ئەگەر بیخواردایە هێندەی دەخوارد كە نەمرێت بۆیە زۆر بێ هێز و لاوازی كرد بوو كاتێ گەڕایەوەماڵی خۆی پاش شەش مانگ هاتەوە سەر خۆی و دەیفەرموو: من تووشی دوو تاقیكردنەوە بووم یەكێكیان تاقیكردنەوەی دین بوو كە دەمتوانی بەرگری لێ بكەم بەڵام ئەمە تاقیكردنەوەی دونیایە .[٢٣٩](هارون بن سفیان المستملی) دەڵێت : چووم بۆ لای

---

[٢٣٦] ابن حنبل:( ٧٨ ) ،الامناقب:( ٣٦٩) سير أعلام النبلاء :( ٥١٢/٧) .

[٢٣٧] المناقب:( ٣٦٥) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/ ٥١١) .

[٢٣٨] الطبقات:( ١١ ) ، المناقب:( ٣٦٨).

[٢٣٩] البداية والنهاية :(١٠: ٢٧٥) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٧٧/٧) .

ئیمامی ئەحمەد لەو کاتەدا کەدەیویست پارەکانی متوکل دابەش بکات بە سەر هەژاراندا ، دوو سەد دەرهەمی بە من دا منیش ووتم : ئەم پارەیە بەشم ناکات ، ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: هەر ئەوەندەت دەکەوێت ، بەڵام ئەو سێ سەد دەرهەمە بە سەر هەژاراندا دابەشی بکە هارون دەڵێت : کاتێ پارەکەم لە دەست وەرگرد ووتم : ئەی باوکی عبدالله سوێند بێ بە خوا دەبێ یەك دەرهەمی بە کەس نەدەم ، هارون دەڵێت : ئیمامی ئەحمەد پێکەنی[٢٤٠]،متوکل زۆر ڕێزی لە ئیمامی ئەحمەد دەگرد و زۆر خۆشی دەویست و ئەو خواردنەی کە خۆی دەیخوارد هەموو ڕۆژێك بۆ ئیمامی ئەحمەدیشی دەنارد بەڵام ئیمامی ئەحمەد نەیدەخوارد و دەیدا بە خەڵکی و خۆی بە ڕۆژوو دەبوو ، هەردوو کوڕەکەی ئیمامی ئەحمەد کە عبدالله و صالح بوون و یەکێك لە مامەکانی ئەوخەڵات و پارەیەی کە متوکل دەینارد وەریان دەگرد بە بێ ئەوەی ئیمامی ئەحمەد بزانێت وەکاتێ زانی پێی وتن کە وەری نەگرن کەچی ئەوان هەر وەریان دەگرد بۆیە ئەو دەرگایەی کە لە نێوان خانۆکانیاندا بوو ئیمامی ئەحمەد گردی و چیتر نانی لە ماڵی ئەوان نەدەخوارد و لە پشتی مامی یە وە نوێژی نەدەکرد کە ئیمامی مزگەوتێکی نزیکی ماڵی ئیمامی ئەحمەد بوو وە دەچوو بۆ مزگەوتێکی تر.[٢٤١] هەرچەندە جارێکیان عبدالله بە باوکی فەرموو: ئایە بۆم هەیە بەو پارەیەی کە متوکل بۆی ناردووین حەج بکەم ؟فەرمووی: بەڵێ ، عبدالله فەرمووی: ئیدی بۆ وەرت نەدەگرد ؟ ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : کوڕی خۆم ، من ئەو پارەیە بە حەرام نازانم بەڵکو خۆم لێی دەپاراست[٢٤٢]. وە هەر لە سەردەمی متوکل دا هیچ کەسێك لە سەر کار دانەئەنرا بە بێ پرسی ئیمامی ئەحمەد بۆ نمونە : بە پرسی ئیمامی ئەحمەد

---

[٢٤٠] المناقب:( ٢١٩ ) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٨١/٧ ) .

[٢٤١] البداية والنهاية:( ١٠ : ٢٧٥ ) ، المناقب:( ٣٨٢ ) ، سير أعلام النبلاء :( ٥١٣/٧ ) .

[٢٤٢] ابن حنبل:(٧٩ ) ، المناقب:( ٣٨٥ ) ، سير أعلام النبلاء :( ٥٣٨/٧-٥٣٩ ) .

( احمد بن ابي دؤاد) له سەر کارەکەی لادرا و یحیی بن اکتم له جێگەی دانرا ،متوکل نامەیەکی بۆ ئیمامی ئەحمەد نارد بە مەبەستی پرسیار کردن دەربارەی قورئان بەڵام ئەم جارەیان پرسیاری تاقیکردنەوە نەبوو بەڵکو پرسیاری فێربوون بوو ، بۆ ئەوەی خۆی و موسڵمانان له مەسەلەکە بە تەواوی بگەن ئەویش بە شێوەیەکی رێکو پێك و زانستیانە وەڵامی دایەوەو زیاتر بایەخی دەدا بە بەڵگەی قورئانی پیرۆز و فەرموودە . وە هەروەها ئیمامی ئەحمەد پرسی پێ کرا کە ئایە ئەم کەسانە چۆنن و ئایە شیاوی ئەوەن بخرێنە سەر کار ئەوانیش :

أحمد بن رباح و ابن الخلنجي و شعیب بن سهل و عبیدالله بن احمد و ابي شعیب ، ئیمامی ئەحمەد لە وەڵامدا فەرمووی : هەموویان جەهەمین . پرسیاری لێ کرا دەربارەی محمد بن منصور فەرمووی : هاوڕێی ابن ابي دؤاد ە ،وە پرسیاری لێ کرا دەربارەی ابن علی بن الجعد فەرمووی :جەهەمییە وەدەڵێن له قسەکانی خۆی پاش گەز بووەتەوە ، وەپرسیاری لێ کرا دەربارەی الفتح بن سهل فەرمووی : جەهەمیيە و هاوڕێی (المریسی) ە ، وەپرسیاری لێ کرا دەرباری ابن الثلجي فەرمووی :بیدعەچییەو ئارەزوو پەرستە ، وەپرسیاری لێ کرا دەربارەی ابراهیم بن عتاب فەرمووی: نایناسم بەڵام هاوڕێی (المریسی) ە،[٢٤٤].

متوکل ویستی کە (المعتز)ی کوڕی بنێرێت بۆ فێربوونی زانست و گوێ گردن لە فەرموودە لای ئیمامی ئەحمەد بەڵام ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : من سوێندم خواردووە کە چیتر فەرموودە نەگێڕمەوە تاکو دەمرم[٢٤٥]، چونکە ئیمامی ئەحمەد پێش مردنی بە ماوەیەك وازی لە فەرموودە گێڕانەوە هێنا[٢٤٦].

---

[٢٤٤] المناقب:( ١٨٣ ) ، سير أعلام النبلاء :( ٥٢٣/٧ ) .

[٢٤٥] المناقب:( ٣٧٥ ).

[٢٤٦] المناقب :(٣٦٩).

## ژن و مندالەكانى ئيمامى ئەحمەد*

ئيمامى ئەحمەد لە ژيانيدا سێ ژنى هێناوە يەكەميان لە تەمەنى چل ساڵيدا هێناى ناوى عباسە ى كچى الفضل بوو ، ئيمامى ئەحمەد دەڵێت : بيست ساڵ لە گەڵ عباسە دا پێكەوە بووين لە سەر يەك وشە جياوازيمان نەبوو ، لەم خيزانە تەنها( صالح) ى بوو كە پێيان دەگوت (ابو الفضل) گەورەترين كورِى ئيمامى ئەحمەدە ساڵى ٢٠٣ ك لە دايك بووەو ساڵى ٢٦٥ ك كۆچى دوايى كردووە واتە لە تەمەنى ٦٢ ساڵيدا ، ئيمامى ئەحمەد زۆر صالح ى خۆش دەويست و رێزى لێ دەگرد ، صالح مندالێكى زۆرى بوو خەريكى بە خێو كردنيان بوو بۆيە ريوايەتى فەرموودەى لە باوكييەوە كەمە ، هەروەها صالح لە ابوالوليد الطيالسي و ابراهيم بن فضل الدراع و علي بن المديني ريوايەتى فەرموودەى كردووە ، هەروەها زوهێرى كورِى خۆى و البغوى و محمد بن مخلد فەرموودەيان لێ گێرِاوەتەوە ، كرا بە قازى لە سەر (ئەصفەهان) و لەوێ كۆچى دوايى كرد ، صالح كاتێ كرا بە قازى اصفهان رۆيشت بۆ ئەوێ چووە مزگەوتێك و دوو ركات نوێژى كرد خەڵكى كۆبوونەوە لە گەڵ مامۆستاكاندا (شيوخ) وە ئەو پەيمانەى كە خەليفە بۆى نوسى بوو خوێنرايەوە ئەويش دەستى بە گريان كرد تاكو بورايەوە ئەمجار مامۆستاكان دەستيان بە گريان كرد ، كاتێ پەيمانەكە خوێنرايەوە مامۆستاكان دوعاى خەيريان بۆ دەكرد .

لە كورِەكانى صالح : ئەحمەد و زوهێر كە لە ساڵى ٣٠٣ ك كۆچى دوايى كردووە .

پاش مردنى عەباسە ئيمامى ئەحمەد دووەم ژن دەهێنێ كە ئەويش ناوى ريحانەى كچى عومەر بووە كە دايكى عبدالله يە، وە عبدالله ساڵى ٢١٣ ك لە دايك بووەو ساڵى ٢٩٠ ك كۆچى دوايى كردووە .

---

* سير أعلام النبلاء :( ٤٥٩/٧ ، ٥٤١-٥٤٢) .

پاش مردنى ريحانه ئيمامى ئەحمەد سێيەم ژن دەهێنێ كه ئەويش ناوى حوسن بووه كه جاريه بووه وخواستويەتى دايكى (الحسن و الحسين) كه به مندالّى مردن .

هەروەها ئيمامى ئەحمەد له حوسن چەند مندالّێكى دى بووه كه ئەوانيش الحسن و محمد و فاطمة و زينب( كه به دايكى على ناسراو بووه) و (عبد) كه سالّى ٢٩٠ كۆچى دوايى كردووه پێى دەگوترا ابو عبد الرحمن و( سعيد) كه سالّى ٢٤١ له دايك بووەو سالّى ٣٠٣ كۆچى دوايى كردووه .

## نوسينەكانى ئيمامى ئەحمەد*

ئيمامى ئەحمەد چەند كتێبێكى نوسيوه كه تاكو ئێستا بوونەته سەرچاوەى زانيارى خەڵك و زانايان وەتاكو ئێستا له بەر دەستدان لەو كتێبانه :

١ ـ (المسند) [٢٤٧]: پێش ئەوەى دەست بكەينه باسى (مسند)ەكەى ئيمامى ئەحمەد با بزانين مسند چىيه ؟ مسند : يەكێكه لەو جۆره كتێبانەى كه زانايانى فەرموودەناس دايدەنێن كه ئەويش سێ جۆره :

يەكەم : بەشێكى رێك خراوه به گوێرەى پيتى هجائى واته ئەو فەرموودەناسه دێت هەر فەرموودەيەك كه( ابو بكر الصديق) گێڕاويەتيەوه دەينوسێ چونكه پيتى يەكەمى به (أ) دەست پێ دەكات پاشان هاوەڵێكى دى تاكو ئەو هاوەڵانەى به پيتى (أ) دەست پێدەكات نامێنێ ، پاشان پيتى (ب) ئەمجار پيتى (ت) .. ..هتد

دووەم : بەشێكى دى رێك خراوه به گوێرەى پێشينى بوون به موسڵمانى ئەو هاوەڵه كه فەرموودەكه دەگێڕێتەوه بۆ نمونه له پێش

---

* سير أعلام النبلاء :( ٧/٥٣٩) .

[٢٤٧] مباحث في التدوين السنة المطهرة:( ١٩٣ ) ،ابن حنبل:( ١٥٩ –١٦٧).

هەموویانەوە ئەو دە کەسە دێن کە موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە پاشان ئەوانەی بەشداری جەنگی بەدریان کردووە ..هتد

سێیەم : بەشێکی دی ڕێك خراوە بە گوێرەی نزیکی هاوەڵەکە کە فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) واتەپێش هەمویان بنەماڵەی عبد المطلب پاشان بنی هاشم ...هتد

جا ئیمامی ئەحمەد کە بە (أمير المؤمنين في الحديث) ناسراوە مسند ێکی داناوە کە بووەتە سەرچاوەیەکی گرنگ لە فەرموودەدا ، ئەم کتێبە لە نزیکەی ٢٨٠ کەسەوە ریوایەتی کردووە و شەش مجلدە و سی هەزار فەرموودەی لە خۆ گردووە بە بێ دووبارە بوونەوە و چل هەزار فەرموودە بە ئەو فەرموودانەی کە دوو بارە بووەتەوە ئیمامی ئەحمەد لە نێو ٧٥٠حەوت سەدو پەنجا هەزار فەرموودەدا گوڵبژێری کردووە ،لە ساڵی ١٨٠ ك دەستی کرد بە کۆکردنەوەی فەرموودە کە بووە بناغەیەك بۆ ئەم (مسند) ە ئیمامی ئەحمەد بە عبدالله کوڕی فەرموو : کوڕم ئەم (مسند)ە بپارێزە چونکە دەبێتە سەرچاوەیەك و پێشەوایەك بۆ خەڵکی .

عبد الله ی کوڕی ئیمامی ئەحمەد هەستاوە بە ڕێکخستنی ئەم (مسند)ە وە زۆربەی ریوایەتەکان لە ئەوەوە بووە هەروەها صالح و حنبل ی کوڕی لێوەی گێڕاوەتە، وە ئەگەر تەماشایەکی (مسند) بکەین دەبینین لە شەش بەش پێك هاتووە کە زانایان ڕێکیان خستووەو بەم شێوە دایان ناوە :

١–بەشێکی عبد الله ی کوڕی ئیمامی ئەحمەد لە باوکیەوە ریوایەتی کردووە کە سێ لە سەر چواری مسندەکەیە .

٢–بەشێکی عبدالله لە باوکییەوە و چەند شەیخێکی ترەوە ریوایەتی کردووە.

٣-بەشێكی عبدالله لە خەڵكی ترەوە ريوايەتی كردووە نەك لە باوكيەوە ئەمەيش پێی دەڵێن ( زوائد عبدالله).

٤-بەشێكی عبدالله خوێندويەتی يەوە بە سەر باوكيدا و باوكی پێی رازی بووە بەڵام لە باوكييەوە نەيبيستووە .

٥-بەشێكی تر عبدالله لە كتێبێكدا لە كتێبەكانی باوكييەوە بينيويەتی كە بە دەست و خەتی باوكی بووە .

٦-بەشێكی دی ابوبكر القطيعي ريوايەتی كردووە لە خەڵكی ترەوە نەك لە عبدالله و باوكييەوە ئەمەش پێی دەڵێن( زوائد القطيعي) ئەم بەشەيش زۆر كەمە .

زانايانی فەرموودەناس دەربارەی صيحەتی فەرموودەكانی ناو مسند بوونە بە سێ بەشەوە :

١-كۆمەڵێك دەڵێن هەموو فەرموودەكانی مسند( صحيح) ن لەو زانايانە (ابوموسى المدينى) و (احمد بن عبدالرحمن البنا)

٢-كۆمەڵێك دەڵێن (صحيح و حسن و ضعيف) ی تێدايە وەكو( ابن الجوزى) كە ٢٩ فەرموودەی( موضوعي) لە مسند دەرهێناوە وەهەروەها العراقى كە ئەويش ٩ فەرموودەی( موضوع) ی دياری كردووە جگە لە ٢٩ فەرموودەكەی ابن الجوزى .

٣-كۆمەڵێكی تر دەڵێن فەرموودەكان (صحيح) ن و هەندێ فەرموودەی (ضعيف) ی تێدايە بەڵام نزيكی (حسن) ن لەو زانايانە (ابن تيمية و سيوطي والذهبي و ابن حجر العسقلاني ).

ئيمامی( سيوطي) رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت : هەر فەرمودەيەك كە لە( مسند) ی ئيمامی ئەحمەد دا هەيە وەردەگيرێت و ئەو فەرموودانەی كە( ضعيف) ن نزيكی (حسن) ن .وە ابن حجر العسقلانى رەحمەتی خوای لێ بێت

کتێبێکی لەم بارەیەوە نوسیوە بە ناونیشانی ( القول المسدد في الذب عن مسند الامام احمد) رەدی ئەو کەسانە دەداتەوە کە دەڵێن لە( مسند) دا موضوع هەیە وە دەڵێت ( لە مسند دا فەرموودەیەك نییە کە( اصل) ی نەبێ جگە لە سێ فەرموودە نەبێ ).وابن تیمیە رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت:-( لە مسند دا فەرموودەی (موضوع) نییە و ئەگەر هەبێت لەو جۆرە (موضوع) ە نییە کە راوی فەرموودەکە درۆزن بێت بەڵکو لەو جۆرەیە کە راوی فەرموودەکە لێی تێك چووە یا لە بیری چووە) .

هەروەها لە نوسینەکانی ئیمامی ئەحمەد :

٢- التفسير .

٣- الناسخ والمنسوخ .

٤- التاريخ .

٥- حديث الشعبة .

٦- المقدم والمؤخر في القرآن .

٧-جوابات القران.

٨-المناسك الكبير والصغير .

٩- الرد على من ادعى التناقض في القرآن .

١٠- فضائل الصحابة .

١١- الزهد .

١٢-الاشربة .

١٣- المسائل .

١٤ – علل الحديث .

١٥ –الورع .

١٦-نفي التشبيه .

١٧-الرد على الزنادقة .

١٨-الإمامة .

## لە خواترسانی ئیمامی ئەحمەد

لە سەرەتای تاقیکردنەوەکەدا ئیمامی ئەحمەد زۆر جۆر لە جۆرەکانی تاقیکردنەوە تاقیکرایەوە ،(مأمون) بە قەید وزنجیر .. (معتصم)بە سجن و حەپس و لێدان ..( واثق) بە تەنگ کردنی ژیان لێی و نەهێشتنی تێکەڵ بوونی لە گەڵ خەڵکیدا ..(متوكل) بە نیعمەت و رێز .. پاشان نەفسەکەی دەیویست لەو هەموو شهرەت و بەناوبانگییەو باسکردنەی خەڵکی لە رێگای راست لایدا کەچی ئیمامی ئەحمەد لەو هەموو تاقیکردنەوانە بە سەر کەوتووی دەرچوو و سەر ی بۆ هیچیان دانەنواند .

ئیمامی ئەحمەد لە حەفتەیەکدا دوو جار خەتمی قورئانی پیرۆزی دەکرد کە یەکێکیان بە شەو بوو ئەویتریان بە رۆژ وە شەوێکیان لە مەککە هەموو قورئانی خوێندەوە لە نوێژدا[٢٤٨] . اسحاق الهانیء دەڵێت : رۆژێك ویستم ئەحمەد کتێبی( الزهد) کە خۆی نوسیویەتی بۆ بخوێنێتەوە ، ئەویش حەسیرێکی بۆ راخست لە گەڵ سەرینێکدا ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: ئەمە چییە ؟ ووتم : بۆ ئەوەی لە سەر ی دانیشی . ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: هەڵی بگرە زوهد چاك نابێت تەنها بە زوهد نەبێت پاشان خۆی هەڵیگردوو لە سەر گڵەکە دانیشت[٢٤٩].وەئیمامی ئەحمەد هەرگیز نەیدەهێشت هیچ کەسێك ئاوی دەستنوێژی بۆ ئامادە بکات[٢٥٠] . وەزۆر جار دەیفەرموو : گەر دەتانەوێت

---

[٢٤٨] الطبقات :(٩).

[٢٤٩] الطبقات:( ١٠ ) ،المناقب:( ٢٤٦) ، سير أعلام النبلاء :( ٥٣٨/٧) .

[٢٥٠] الطبقات:( ١٢ ) ،المناقب:( ٢٨٥) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٧٤/٧) .

دڵەکانتان نەرم بێت ئەوا بچن بۆ قەبرستان و دەست بە سەر هەتیواندا بهێنن[٢٥١] . ئیمامی ئەحمەد پێناسەی تەمەنی گەنجی دەکرد و دەیفەرموو : تەمەنی گەنجی لای من وەکو شتێك بوو لە کۆشمدا و ئەمجار کەوتە خوارەوە.[٢٥٢]

عبد الصمد بن سليمان بن ابي مطر دەڵێت : شەوێك میوانی ئیمامی ئەحمەد بووم ئەویش هەندێ ئاوی بە تەنیشتمەوە دانا بۆ سبەینی کە لە خەو هەستاین ئیمامی ئەحمەد بینی ئاوەکەم بە کار نەهێناوە ئیمامی ئەحمەد فەرمووی:(صاحب الحديث) شەوانە هەڵناسێت و شەو نوێژ ناکات !!؟ منیش ووتم : لە سەفەردام . ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: با لە سەفەریشدا بیت، ئەی نازانیت (مسروق) کاتێ حەجی کرد بە سوجدەوە خەوی لێ کەوت .[٢٥٣]

ئیمامی ئەحمەد لە شەو و ڕۆژێکدا سێ سەد رکات نوێژی دەکرد بەڵام کاتێ نەخۆش کەوت بە هۆی ئازاردانییەوە لە شەو و ڕۆژێکدا سەدو پەنجا رکات نوێژی دەکرد* .

اسماعيل الديلمی دەڵێت : لە ماڵی ئیمامی ئەحمەد بووم درا لە دەرگا چووم دەرگام کردەوە و بینیم گەنجێك راوەستاوە ووتم : فەرموو چ ئەمرێکت هەیە .؟فەرمووی :( ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)م دەوێ، منیش چوومە ژوورەوە و ووتم : ئەی باوکی عبدالله گەنجێك لە دەرگا راوەستاوە و تۆی دەوێ ، ئەویش دەرچوو سڵاوی لێ کرد و ئەویش فەرمووی : ئەی باوکی عبدالله زوهد لە دونیادا چیە ؟ ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : (زوهری) دەڵێت : زوهد لە دونیادا ئەوەیە کە مرۆڤ کەم هیوا بێت فەرمووی : ئەی باوکی عبدالله بۆم روون

---

[٢٥١] الطبقات:( ٣٩).

[٢٥٢] المناقب:( ١٩٨) ، سير أعلام النبلاء :( ٥٢٧/٧) .

[٢٥٣] المناقب:( ١٩٩).

* سير اعلام النبلاء (٤٧٦/٧).

بکەرەوە. ئیمامی ئەحمەد فەرمووی:(گەنجەکە لە بەر رۆژەکە راوەستا بوو ئیمامی ئەحمەدیش لەسیبەرەکە) :ئەوەیە کە هیوات بەوە نەبێت کە لە بەر رۆژەکەوە دەگەیتە سێبەرەکە. گەنجەکە ویستی بڕوات ، ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : راوەستە ، ئیمامی ئەحمەد چووە ژوورەوە کیسەیەکی (صره) دەرهێنا و دای بە گەنجەکە ، گەنجەکە فەرمووی : ئەی باوکی عبدالله کەسێك کە لە بەر رۆژەکە نەگاتە سێبەرەکە چی بکات بە ئەمە ؟ ئەمجار گەنجەکە رۆیشت [٢٥٤] .

(احمد بن محمد التستري) دەڵێت : جارێکیان ئیمامی ئەحمەد سێ رۆژ بوو نانی نەخواردبوو چونکە نەیبوو بۆیە ناردی بۆ لای یەکێك لە برادەرەکانی هەندێ ئاردیان بۆ قەرز کرد جا لەبەر ئەوە لەماڵەوە زانیان ئیمامی ئەحمەد چەند برسییەتی بە پەلە بۆیان کرد و هێنایانە بەر دەستی ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: چۆن وا زوو ئامادەتان کرد ؟ فەرموویان : تەنووری ماڵی صالح ی کوڕت سوور و ئامادە بوو لەوێ کردمان بەنان ، ئەویش فەرمووی: هەڵیبگرن ناخۆم ، وەفەرمانی کرد ئەو دەرگایەی کە لە نێوان خۆیان و ماڵی صالح دا بوو بیگرن چونکە صالح پارەی لە متوکل وەردەگرد [٢٥٥] .

ئیمامی ئەحمەد گەر (نەصرانی)یەکی ببینیایە چاوەکانی خۆی دادەخست و دەیفەرموو : ناتوانم تەماشای کەسێك بکەم کە بە ناوی خوداوە درۆی کردبێ [٢٥٦] .

(المروزی) دەڵێت : جارێکیان چووم بۆ لای ئیمامی ئەحمەد و لێم پرسی : ئێستا چۆنی ؟ ئیمامی ئەحمەد لە وەڵامدا فەرمووی : چۆن بم ؟ کەسێك

---

[٢٥٤] المناقب:( ١٤٨).

[٢٥٥] البداية والنهاية:( ١٠ :٢٧٥ ) ،المناقب:( ٢٦١) ، سير أعلام النبلاء :( ٤٧٧/٧) .

[٢٥٦] الطبقات:( ١٢ ،٥٦ ) ،المناقب:( ٢٦٠).

کەخواکەی داوای جێ بەجێ کردنی فەرزەکانی لێ بکات وپێغەمبەرەکەی(ρ) داوای شوێن کەوتنی سوننەتەکانی لێ بکات و هەردوو فریشتە داوای چاك کردنی کردەوەکانی لێ بکەن و نەفسەکەی داوای بە جێ هێنانی ئارەزووەکانی لێ بکات و ئیبلیس داوای خراپەکاری لێ بکات و فریشتەی مردن داوای وەرگرتنی روحەکەی لێ بکات و منداڵەکانی داوای خەرجی لێ بکەن[٢٥٧].

سعید ی کوڕی یعقوب دەڵێت :ئیمامی ئەحمەد نامەیەکی بۆ نوسیم ئەمە دەقی نامەکەیە (بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان ..امابعد: بزانە کە دونیا وسوڵتان نەخۆشین وەزانا پزیشکە ..گەر بینیت پزیشکێك نەخۆشی بۆ خۆی رادەکێشا ئەوە وریا بە ..والسلام علیکم)[٢٥٨] عبدالله دەڵێت : کەس باوکمی نەدەبینی جگە لە مزگەوت یان لە شوێن کەوتنی جەنازەدا یان لە سەردانی نەخۆشی دا نەبێ وەپێی ناخۆش بوو کە بە بازاڕدا بگەڕێت[٢٥٩].

(اسماعیل بن اسحاق التقي) دەڵێت : یەکەم جار کە ئیمام ئیمامی ئەحمەدم بینی پێم گوت :ئەی باوکی عبدالله رێگەم بدەن کە سەرت ماچ بکەم فەرمووی: من نەگەیشتوومەتە ئەو پلە و پایەیە.[٢٦٠]

کابرایەك نامەیەکی بۆ ئیمامی ئەحمەد ناردبوو تیایدا داوای لێ کردبوو کە دوعای بۆ بکات ئیمامی ئەحمەد فەرمووی : گەر ئێمە دوعامان بۆ کردی ئەی کێ دوعا بۆ خۆمان بکات؟[٢٦١]. وەزۆر جار ئیمامی ئەحمەد دەیفەرموو : من کێم دێن بۆ لام ؟ من کێم دێن بۆ لام ؟ بڕۆن بۆ فەرموودە وەرگردن.[٢٦٢]

---

[٢٥٧] المناقب:( ٢٨٤ ) ، سير أعلام النبلاء :( ٧/٤٨٤ ) .

[٢٥٨] المناقب:( ٢٠٧ ).

[٢٥٩] المناقب:( ٢٠٨ ).

[٢٦٠] المناقب:( ٢٧٥ ).

[٢٦١] المناقب:( ٢٧٥ ).

[٢٦٢] المناقب:( ٢٧٦ ).

ئیمامی ئەحمەد کاتێ نوێژی دەکرد ئەمجار دەچووە ماڵەوە قوتابییان و خەڵکی شوێنی دەکەوتن ئەویش دەیفەرموو : کەس شوێنم نەکەوێت ( واتە حەزی نەدەکرد کەس لە دەوری کۆ ببێتەوە ) [٢٦٣]

## نەخۆش کەوتن و کۆچی دوایی ئیمامی ئەحمەد[٢٦٤]

لە مانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی ٢٤١ ك پێشەوا تووشی تایەکی سەخت بوو پاشان بێ هێز و بێ توانا بوو لە جێ کەوت و خەڵکی کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتن بۆ سەردانی و دوعایان بۆ دەکرد و دەڕۆیشتن ، کابرایەك هاتە ژوورەوە وچووە لای سەری ئیمامی ئەحمەد و فەرمووی : لە رۆژی لێدانەکەتدا من ئامادە بووم ئەمجار دەستی بە گریان کرد و فەرمووی: یان تۆڵەی خۆتم لێ بسێنەوە وام لە بەر دەستتدا وەیان گەردنم ئازاد بکە . ئیمامی ئەحمەد فەرمووی: ئایە جارێکی تر دەگەڕێیتەوە بۆ سەر ئەو کارە ؟ فەرمووی : نەخێر .فەرمووی : گەردنت ئازاد بێت ، کابرا دەستی بە گریان کردوو چووە دەرەوە، هەموو ئامادە بوان دەستیان بە گریان کرد . پاشان خەڵکەکە هێندە زۆر بوو بۆیە سوڵتان چەند کەسێکی نارد بۆ پاراستنی هێمنی و ئاسایشی کۆڵان و گەڕەکەکە بۆ ئەوەی خەڵکی بە ریز بچنە ژوورەوە بۆ لای ئیمامی ئەحمەد ، وەکاتێ ئیمامی ئەحمەد وەزعی خراپتر بوو بۆیە چیتر نەیاندەهێشت خەڵکی بچێت بۆ سەردانی و هەموو دەرگاکانیان داخست . کاتێ خزمەتکارێکی (ابو یوسف )ی مامی ئیمامی ئەحمەد هات بۆ لای بۆ ئەوەی باوەشێنی بکات ئیمامی ئەحمەد بە دەستی ئیشارتی کرد کەواز بهێنە و نامەوێ چونکە ئەو خزمەتکارە بە پارەی خەلیفە سنرا بوو ئیمامی ئەحمەدیش پێی ناخۆش بوو [٢٦٥]

---

[٢٦٣] المناقب:( ٢٨٢).

[٢٦٤] المناقب:( ٤٠٢ —٤٠٩ ) ، ابن حنبل:( ١٢) ، سير أعلام النبلاء :( ٥٤٣/٧) .

[٢٦٥] الطبقات:( ١٢).

کابرایەك هات بۆلای ئیمامی ئەحمەد و فەرمووی : ئەی ئیمامی ئەحمەد ئەو کاتە بهێنە یادی خۆت کە لە بەر دەستی خوادا راوەستاوی ئیمامی ئەحمەدیش دەستی بە گریان کرد .

پاشان ئیمامی ئەحمەد داوای کرد کە وەسێتەکەی بۆ بخوێننەوە ئەوانیش بۆیان خوێندەوە و ئەویش پێی رازی بوو و داوای کرد کە هەندێ خورما بکڕن و بیدەن بە هەژاران لە جێیی کەفارەتی سوێندەکەی و پاشان سوپاس گوزاری خوا بوو .وەلە ماوەی ئەو چەند رۆژەی کەنەخۆش کەوت بوو ئیمامی ئەحمەد هەموو رۆژێك هەواڵی دەگەیشتە خەلیفە (متوکل) خوای لێ رازی بێت . ئیمامی ئەحمەد وای لێ هاتبوو کە بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد ، لە رۆژی چوار شەممە دا داوای کرد کە منداڵەکانی لێ کۆبکەنەوە ئەویش بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە دەستی بە سەریاندا دەهێنا و بۆنی ئەوانی دەکرد ، پاش ماوەیەك نەخۆشییەکەی هێندە زۆر بوو کە میزەکەی بوو بە خوێن ، لە رۆژی پێنج شەممە دا نەخۆشییەکەی زیاتر بێ تاقەتی کرد وعبدالله ی کوڕی دەست نوێژی بۆ دەگرد.

عبدالله دەفەرمووێت :– کاتێ باوکم لە سەرە مەرگدا بوو من لە نزیکی ئەو دانیشتبووم باوکم چەند جارێك دەبورایەوە و ئەمجار هەڵدەستا و چاوی دەکردەوە و بە دەستی ئیشارەتی دەکردوو دەیفەرموو :– هێشتا نا...هێشتا نا (لا بعد لابعد) سێ جار . لە پاش جاری سێیەم گوتم :– بابە گیان ، ئەوە چیت گوت لەم کاتەدا ؟ فەرمووی :– کوڕم ، نازانیت ؟ ! گوتم :– نەخێر ، فەرمووی :– کوڕم ،، ئەوە (ئیبلیس)ە لەعنەتی خوای لێ بێت لە خواری پێمەوە ، پەنجەکانی خۆی دەگەزێت و دەڵێت :– ئەی ئەحمەد لە دەستم دەرچوویت ،،، منیش دەڵێم :– هێشتا نا تاکو نەمرم *.

---

* سیر اعلام النبلاء (٥٤٧/٧) .

کاتیٚ شەوی جومعە بوو زبانی قورس بوو ئەمجار کە ڕۆژ بووەوە واتە ڕۆژی هەینی ١٢ ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٢٤١ ك وەلەتەمەنی ٧٧ ساڵیدا ئیمامی ئەحمەد، پێشەوای موسڵمانان ،دوژمنی بیدعەو بیدعەچییەکان ، دۆستی سوننەو سوننییەکان ، ڕووی کردە قیبلەو فەرمووی: (لا إلـــهَ إلاَّ اللهُ) ئەمجار گیانی پاکی دەرچوو[٢٦٦] ،(المروزی) چاوەکانی بە یەك نا[٢٦٧]، ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً (٢٨)﴾ خودای گەورە لە گوناهەکانی ئێمە و ئەویش خۆش بێت و هەمووماں بە بەهەشتی بەرین شاد بکات . بە مردنی ئیمامی ئەحمەد ئوممەتی ئیسلامی تووشی زەرەرو زیانێکی گەورە بوو چونکە کەڵە پیاوی وەك ئیمامی ئەحمەد دوو بارە بوونەوەی زۆر کەمە بەڵام فەرمانی خودایە و خۆی فەرموویەتی : ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾ کاتیٚ خەڵکی زانیان وا پێشەوا کۆچی دوایی کردووە هەموویان دەستیان بە گریان کردوو هاوارو ناڵەیان بەرز بووەوە ، ئەمجار هەموو دانیشتن بۆ ئەوەی بیبەن بۆ گۆڕستان .( عبدالله ی کوڕی ئیمامی ئەحمەد) دەڵێت : لەوە ترسام کە ئەو هەموو خەڵکە نوێژی جومعەیان لە دەست بچێت بۆیە بە خەڵکەکەی فەرموو کە پاش نوێژی جومعە دەینێژین . لە پاش شوشتنی ئیمامی ئەحمەد ئەو سیٚ تەڵە قژەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەلای ئیمامی ئەحمەد بوو هەرچاوەی تەڵێکیان تیٚ کرد و ئەویتریان خستە سەر زبانی چونکە خۆی وەسێتی کردبوو .

ئەمجار (محمد بن عبدالله الطاهر) نوێژی لە سەر کرد ، بۆیە چەند جارێك متوکل خەلیفەی موسڵمانان پێی دەفەرموو : موژدە بۆ تۆ ئەی محمد کە نوێژت لە سەر ئیمامی ئەحمەد کرد[٢٦٨]. پاشان بردیان بۆ گۆڕستان نزیکەی یەك ملیون

---

[٢٦٦] حلية الاولياء:( ٩ :١٦٢).

[٢٦٧] الطبقات:( ٦٩).

[٢٦٨] الطبقات:( ١٦).

و نيو كەس لە دواى جەنازەكەى بوون و نوێژيان لە سەر كرد جگە لە شەست هەزار ئافرەت . (عبدالوهاب الوراق) دەڵێت : لە مێژوودا نەبووە هيچ كەسێك بەو ژمارەيە نوێژى لە سەر بكرێت جگە لە كابرايەكى بنى اسرائيلى

نەبێت[٢٦٩]. وە لە كاتىَ ناشتنيدا خەڵكى بە دەنگى بەرز لەعنەتيان دەكرد لە (كرابيسي) و (المريسي) كە دوو كەسى ئەهلى بيدعە بوون دژايەتى ئيمامى ئەحمەديان دەكرد وە ئەو رۆژەى كە ئيمامى ئەحمەد كۆچى دوايى كرد دەڵێن لە شارى بەغدادا نوێژى عەسر لە مزگەوتەكاندا نەكرا تەنها لە مزگەوتى (حارث) نەبێت .

## بيروباوەڕى ئيمامى ئەحمەد*

### * ئيمان :

ئيمامى ئەحمەد دەڵێت : ئيمان وتەو كردەوەيە (قولٌ وعمل) زياد دەكات كەم دەكات چاكە هەمووى لە ئيمانەوەيەو ئيمانى پىَ زياد دەكات و خراپە لە ئيمان كەم دەكات[٢٧٠] .

سيفەتى ئيماندار لە ئەهلى سوننەو جەماعە ئەوەيە شايەتى بدات كە هيچ پەرستراوێك نىيە شايستەى پەرستن بێت جگە لە (الله) خوا نەبێت ، تەنها و بىَ هاوەڵە،وە (محمد ﷺ) بەندەو نێردراوى ئەوە ، وە باوەڕى هەبێت بەوەى كە هەمووپێغەمبەران (سەڵات و سەلامى خواى لە سەر بێت) هێناويانە وە دڵى گرىَ دابێت لە سەر ئەوەى كە بە زارى دەيلێت وە گومانى لە ئيمانەكەى خۆى نەبێت ، ئەوەى يەكتاپەرست بێت بە گوناه( تاوان) كافر نابێت ، وەئەو شتەى كە غەيبە دەيگێڕيتەوە بۆ لاى خوا[٢٧١] ، وە بزانێت كە هەموو شتێك بە قەزا و

---

[٢٦٩] الطبقات:( ١٦) ، تاريخ بغداد : (٤٢٢/٤) .

* سير اعلام النبلاء (٥١٧/٧-٥١٩) .

[٢٧٠] البداية والنهاية:( ١٠: ٢٧٤) ،الطبقات:( ٢٥) ،ابن حنبل:( ١٢٥) ،المناقب:( ١٥٣) ، سير أعلام النبلاء :( ٥١٧/٧)

[٢٧١] ابن حنبل:( ١٢٥) ،المناقب:( ١٦٥-١٦٦).

قەدەری خوا دەبێت( چ خەیر بێت یا شەڕ ) وەنابێت حوکم بدات بە سەر کەسدا بە بەهەشت بە چاکەیەك کە بیکات وەبە ئاگر بە تاوانێك کە کەسێك دەیکات تاکو ئەو ڕۆژەی کە خوای گەورە خەڵکی دەکاتە بەهەشتەوە یان دۆزەخەوە[٢٧٢] ، وە حەقی پێشینەکان (سەلەف) بزانێت ئەوانەی کە خوای گەورە هەڵیبژاردوون بۆ هاوەڵی و هاوڕێتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)[٢٧٣] ، وە کەسی وا هەیە لە ئیمان دەردەچێت بۆ ئیسلام (واتە : لە ئیماندارەوە دەبێت بە موسڵمان) وە ئەگەر تەوبە بکات دەگەڕێتەوە بۆ ئیمان وە لە ئیسلام دەرناچێت تەنها شیرك نەبێت یان فەرزێك لە فەرزەکانی خوا ڕەد بکاتەوە و باوەڕی پێی نەبێت وە ئەگەر بە هۆی تەمەڵییەوە ئەرکێك لە ئەرکەکان نەکات ئەوا دەکەوێتە ئارەزووی خوای گەورەوە گەر ئارەزووی بوو سزای بدات ئەوا سزای دەدات و گەر ئارەزووی بوو لێی خۆش بێت ئەوا لێی خۆش دەبێت[٢٧٤] ، ئیماندار دەبێت باوەڕی بە سزای ناو گۆڕ و (نکیر و منکر) و حەوز و شەفاعەت هەبێت ، وە دەبێت باوەری بەوە هەبێت کە ئەهلی بەهەشت لە بەهەشتدا خوای خۆیان دەبینن[٢٧٥] وەیەکتاپەرستان لە ئاگر دەردەچن پاش تاقیکردنەوەیان هەروەکو چۆن فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) لە سەریان هاتووە و زانایان لە سەر ئەمە یەك دەنگن .[٢٧٦]

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : شایەتی بە سەر ئەهلی قیبلەدا نادەین بە بەهەشت یاخود بە ئاگر بە کردەوەیەك کە بیکەن ، وەرجامان هەیە بۆ پیاو چاکان و لە گوناهباران دەترسین و رجامان هەیە لای خوا کە ڕەحمیان لێ بکات

---

[٢٧٢] ابن حنبل:( ١٢٦).

[٢٧٣] المناقب:( ١٦٥).

[٢٧٤] ابن حنبل:( ١٢٥-١٢٦).

[٢٧٥] ابن حنبل:( ١٣١).

[٢٧٦] المناقب:( ١٦٦).

، وەچ کەسێك گەیشتە لای خوای گەورە بە تاوانێکەوە کە تەوبەی لیّ کردبوو وە سوور نەبوو بوو لە سەری ئەوا خوای گەورە لێی خۆش دەبێت و تەوبە لە بەندەکانی خۆی وەردەگرێت و لە گوناهەکان دەبورێت ، وەچ کەسێك گەیشتەلای خوای گەورە و لە دونیادا سنوورێك لە سنوورەکانی خوای بە سەردا جیّ بە جیّ کرابوو بە تاوانێك کردبێتی کە سزای دونیایی لە سەر بوو ئەوا خوای گەورە خۆی دەزانێت یا لێی خۆش دەبێت وەیا سزای دەدات [٢٧٧] وەدەڵێت : کەسێکی ئەهلی یەکتاپەرست بە کافر نازانین گەر گوناهێك لە گوناهە گەورەکانی کردبوو ( الکبائر) وە هیچ کردەوەیەك تەرك کردنی کوفر نییە تەنها نوێژ نەبێت ، چ کەسێك وازی لە نوێژ هێنا ئەوا کافرەو خوای گەورە کوشتنی حەڵاڵ کردووە[٢٧٨].ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : حەفتا پیاو لە (تابعین ) و پێشەوای موسڵمانان و فەقیهی شارەکان یەك دەنگ بوون لە سەر ئەوەی کە ئەو سوننەتەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سەری مردووە ئەوەیە : یەکەمیان رازی بوونەبە قەزای خوای گەورە و ملکەچی فرمانەکانی بێت و ئارامگرتنە لە سەر حوکمەکانی و ئەوەی کە فرمانی پیّ کردووە بکرێت و دوور کەوتنەوە لەوەی کە نەهی لیّ کردووە و دڵسۆزی لە کارەکاندا مەبەستی تەنها خوا بێت و ئیمانی هەبێت بە قەدەر (خەیر و شەڕ) و واز هێنان لە( المراء و الجدال والخصومات) لە دیندا[٢٧٩] . وەدەڵێت : من خاوەنی کەلام نیم و نابینم قسە کردن لەم شتانەدا کردنی باش بێت جگە لەوەی کە لە کتێبەکەی خواو فەرموودەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) هەبێت یان لە هاوەڵانەوە ئیدی جگە لەوانە ئەوا قسە کردن تیایدا باش نییە[٢٨٠] .

---

[٢٧٧] ابن حنبل:( ١٢٧ ).

[٢٧٨] ابن حنبل:( ١٢٧ ).

[٢٧٩] ابن حنبل:( ١٢٨ ).

[٢٨٠] ابن حنبل:( ١٣٠ ).

*** قورئانی پیرۆز :**

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : هەرکەسێك بڵێت قورئان دروست کراوە( مخلوق)ـە ئەوا کافرە[٢٨١]، قورئان کەلامی خوایەو دروست کراو نی‌یە[٢٨٢]

*** کۆمەڵەکان ( الفِرَق ) :**

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : (رافضي) ئەو کەسەیە کە جوێن بە ابو بکر و عمر دەدات[٢٨٣]. وە نوێژ مەکەن لە پشتی (القدرية و الرافضي) یەوە گەر جوێنیان بە هاوەڵان دا[٢٨٤]. وەزاناکانی موعتەزیلە زەندیقن[٢٨٥]. صالح دەڵێت : پرسیارم کرد لە ئیمامی ئەحمەد : ئایە نوێژ کردن لە پشت (قدری) یەوە دروستە ؟ فەرمووی : ئەو دەڵێت کە خوای گەورە نازانێت بەندەکانی چی دەکەن تائەو کاتەی دەیکەن بۆیە نوێژ لە پشتیانەوە مەکەن[٢٨٦] .

*** ناو و سیفاتەکانی خوای گەورە :**

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : ئەو فەرموودانەو ئایەتانەی کە باسی سیفات دەکەن ئێمەش باسی دەکەین چۆن هاتووە هەروەها وە کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەڵێت : ئەهلی بەهەشت خوای خۆیان دەبینن ئەوا دەبێت باوەڕی پێ بکەین و کێ بڵێت خوای گەورە نابینین لە دوا رۆژدا ئەوا کافرە وە نمونەیشی بۆ ناهێنینەوەو ئەمەش ئیجماعی زانایانە[٢٨٧] .

---

[٢٨١] البداية والنهاية:( ١٠:٢٧٤) ،المناقب:( ١٥٤) ،ابن حنبل:( ١٣٣) ، سير أعلام النبلاء :( ٥١٧/٧) .

[٢٨٢] البداية والنهاية:( ١٠:٢٧٤) ،المناقب:( ١٦٦).

[٢٨٣] المناقب:( ١٦٥ ) ، ابن حنبل:( ١٤٦).

[٢٨٤] المناقب:( ١٥٩).

[٢٨٥] المناقب:( ١٥٨).

[٢٨٦] ابن حنبل:(١٣٠).

[٢٨٧] البداية والنهاية:( ١٠: ٣٢٨) ،المناقب:( ١٥٦) ،ابن حنبل :(١٣٠).

وەئیمامی ئەحمەد باوەڕی بەوە هەیە کە خوای گەورە (قدیم ) ە و سەرەتای نییە هەروەها سیفەتەکانی ، وە کەلامیش بەشێکی ئەو سیفاتانەیە .[٢٨٨]

## * هاوەڵان :

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : باشترین کەس لەم ئوممەتەدا دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ابو بکر الصديق)ـە ئەمجار (عومەری کوڕی خەتتاب )ە و ئەمجار(عوسمان ی کوڕی عەففان )ە پاش ئەم سێ کەسە ئەمجار ئەو پێنج کەسەی شووران کە ئەوانیش (علي بن ابي طالب و زبیر و طلحة و عبد الرحمن بن عوف و سعید) ە هەمویان شایەنی ئەوەن کە بکرێنە خەلیفەی موسڵمانان[٢٨٩] پاش ئەوانە ئەهلی بەدر دێت لە کۆچکەران(المهاجرين) و ئەمجار ئەهلی بەدر لەپشتیوانان (الانصار) ئەمجار پاش ئەمانە هاوەڵانی دی دێن ئەوەی کە هاورێتی پێغەمبەری خوای کردبێت (ﷺ) گەر بۆ یەك چرکەیش بووە و گەر کەسێك یەکێکیان عەیبدار بکات یان ڕقی لە یەکێکیان بێت ئەوە (مبتدع) ە ، وەدەبێت رەحمەتیان بۆ بنێرین[٢٩٠] . وەئەگەر کەسێك بڵێت (علی) لە (عوسمان) باشترە ئەوا بیدعەی کردووە چونکە هاوەڵان رێك کەوتون و فەرموویانە کە (عوسمان) لە (علی) باشترە .[٢٩١]

وەدەڵێت : چ کەسێك بڵێت (علی) لە (ابو بکر) باشترە ئەوا توانج (طعن) ی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوە ، وەکێ بڵێت (علی) لە (عومەر) باشترە ئەوا توانج (طعن) ی لە پێغەمبەرو(ﷺ) (ابو بکر) داوە و کێ بڵێت (علی) لە (عوسمان) باشترە ئەوا توانج (طعن) ی لە پێغەمبەر(ﷺ) و( ابو بکرو عومەر) هەموو کۆچکەران داوە . وە دەبێت رێزی هەموو هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

---

[٢٨٨] ابن حنبل:( ١٣١).

[٢٨٩] ابن حنبل:( ١٤٦ –١٤٧) ، المناقب:( ١٦١).

[٢٩٠] المناقب:( ١٦٦،١٦١).

[٢٩١] المناقب:( ١٦٢).

بگرین بە گەورەو بچووکەوە و باسی باشەکانیان بکەین و باسی ئەوەی کە لە نێوانیاندا رووی داوە نەکەین .

وەابوبکر و عومەرو عوسمان و عەلی و زوبیر و عبدالرحمن ی کوڕی عوف و سعد ی کوڕی ابی وەقاس و سەعید ی کوڕی زەید لە گەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بوون لە سەر کێوی (حراء) پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی : ئەی (حراء) هێور بە بزانە

کە هیچ کەس لە سەرت نییە تەنها پێغەمبەر و صدیق و شەهید نەبێت[٢٩٢] .

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : ابن مسعود فەرموویەتی : هەر شتێك موسڵمانان بە باشیان زانی ئەوا لای خوایش باشە و هەر شتێك موسڵمانان بە خراپیان زانی ئەوا لای خوایش خراپە . وە هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)رازی بوون کە ابو بکر ببێت بە جێنشینی پێغەمبەر (ﷺ).

ابن کثیر دەڵێت : ئەم وتەیەی سەرەوە (اثر) ە باسی ئیجماعی هاوەڵان دەکات لە پێش خستنی ابوبکر بۆ جێنشین .[٢٩٣]

وەپرسیار کرا لە ئیمامی ئەحمەد ئەگەر کەسێك جوێن بە یەکێك لە هاوەڵان بدات ؟ فەرمووی : نایبینم لە سەر دینی ئیسلام بێت[٢٩٤] .

## * خیلافەتی عەلی :

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : باش بزانن کە خیلافەت عەلی نەڕازاندەوە بەڵکو عەلی خیلافەتی رازاندەوە[٢٩٥] . وەپرسیار کرا لە ئیمامی ئەحمەد دەربارەی عەلی و مەعاویە فەرمووی: ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا

---

[٢٩٢] المناقب:( ١٦٦).

[٢٩٣] البداية والنهاية:( ١٠: ٢٧٥).

[٢٩٤] المناقب:( ١٦٥ ) ، ابن حنبل :(١٤٦).

[٢٩٥] المناقب:( ١٦٣ ) ، ابن حنبل:( ١٤٨).

كَسَبْتُمْ وَلاَ تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[٢٩٦] وەدەڵێت : هیچ شتێك دەربارەيان ناڵێم لە چاكە زياتر رەحمەتی خوا لە هەموويان (معاوية و عمرو بن العاص و أبو موسى الأشعري) هەموويان خوای گەورە لە كتێبەكەيدا وەسفی كردوون فەرموويەتی :﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ﴾[٢٩٧] وەدەڵێت : چ كەسێك دان نەنات بە ئيمامەتی عەلی دا ئەوە لە گوێدرێژ گومڕاترە، سبحان الله سنورەكانی خوای جێ بە جێ دەكرد و زەكات و صدقەی كۆ دەكردەوە و دابەشی دەكرد بە سەر خەڵكيدا بە رێك و پێكی ، پەنا بە خوا كەسێك كە باش ناڵێت با خراپيش نەڵێت ، باشترين خەليفە بوو هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) رازی بوون و نوێژيان لە پشتەوە دەكرد و غەزا و جيهاد و حەجيان لە گەڵدا دەكرد پێيان دەفەرموو( أمير المؤمنين) رازی بوون بەوە بە بێ ئەوەی زۆريان لێ كرا بێت و نارازی بن ئێمەيش شوێن كەوتووی ئەوانين .[٢٩٨]

وەدەڵێت : عەلی كوڕی ابو طالب لە (ئەهلی بەيت)ە هيچ كەسێكی لە گەڵدا قياس ناكرێت[٢٩٩] . وە هيچ كەسێك لە هاوەڵان هێندە باسی فەزڵ و چاكەی نەكراوە چۆن باسی ئيمام عەلی كراوە لە فەرموودە راست و دروستەكان[٣٠٠] .

*** فيقه :**

ئيمامی ئەحمەد دەڵێت : ئيماندار دەبێت باوەڕی بە هەردوو نوێژی جەژن و نوێژی ترس و جومعە و جەماعەت هەبێت لە گەڵ هەموو ئەميرێكی چاك و خراپدا وە باوەڕی بە مەسح لە سەر خوف هەبێت لە سەفر ولە شاردا (الحضر)[٣٠١] .

---

[٢٩٦] المناقب:( ١٦٤).

[٢٩٧] ابن حنبل:( ١٤٨ ) ،المناقب:( ١٦٤).

[٢٩٨] ابن حنبل:( ١٤٧ ) ،المناقب:( ١٦٤).

[٢٩٩] ابن حنبل:( ١٤٨).

[٣٠٠] المناقب:(١٦٣) ،ابن حنبل:( ١٤٨).

[٣٠١] المناقب:( ١٦٦).

وه جیهاد لەو ڕۆژەوه كه خوای گەوره پێغەمبەری(ﷺ) ناردووه تاكو ڕۆژی دوایی بەردەوامه تاكو ئەو ڕۆژەی دەججال دەكوژرێت ، وه خراپەی خراپەكاران زیانیان پیٚ ناگەیەنێت واته له موجاهیدان . وه كڕ ین و فرۆشتن حەڵاڵه تا ڕۆژی قیامەت به پێی قورئان و فەرمووده . وه تكبیر كردن له نوێژی مردوو دا چوار( الله اكبر)ه و ئیماندار دەبێت دوعای خەیر بكات بۆ پێشەوای وموسڵمانان و نابێت به ڕوویاندا دەرچێت به شیر (شمشێر) و نابێت له ڕۆژی فیتنه دا شەڕ بكات و دەبێت له ماڵی خۆیدا دانیشێت[٣٠٢] . وەئارام بگرێت له ژێر ئاڵای سوڵتانی موسڵماندا هەرچەنده خراپه و نادادپەروەری لیٚ بووەشێتەوه و نابیٚ به شیر دەرچێت و ڕووبەرویان ببێتەوه هەرچەنده خراپه بكەن[٣٠٣] .

**نامەیەك** .. .. .

كاتێك كه فیتنه دەستی پیٚ كرد و خەڵكی تووشی دوو بەرەكی هاتن له سەر مەسەلەی (القدر و الرفض و الاعتزال و خلق القران و الارجاء) ، (مسدد)ی كوڕی (مسرهد) نامەیەكی بۆ ئیمامی ئەحمەد نووسی تیایدا هاتبوو (سوننەتەكەی پێغەمبەرم بۆ بنووسه(ﷺ)) ، كاتیٚ نامەكه گەیشته ئیمامی ئەحمەد ، ئیمامی ئەحمەد دەستی به گریان كرد و فەرمووی : (انا لله وانا اليه راجعون) ، ئەم (بەصری)یه دەڵێت : پارەیەكی زۆرم خەرج كردووه به مەبەستی فێربوونی زانست و زانیاری كەچی ڕێگا و سوننەتەكەی پێغەمبەر(ﷺ) نادۆزمەوه و ڕێی پیٚ نابەم ، ئەمجار ئیمامی ئەحمەد نامەیەكی بۆ نووسی كه تیایدا هاتبوو ...

---

[٣٠٢] المناقب:( ١٦٦).

[٣٠٣] المناقب:( ١٧٦ ) ،ابن حنبل:( ١٥١).

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە کە لە هەموو سەردەمێکدا لە ئەهلی عیلم چەند کەسانێك دەهێڵێتەوە بۆ ئەوەی بانگەوازی ئەوانە بکەن کە لە رێ لایان داوە بۆ سەر رێگەی راستی و نەهی بکەن لە خراپە ، بە قورئانی پیرۆز مردووەکان زیندوو دەکەنەوە ، بە سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) رێنیشاندەری ئەهلی نەفامی و خراپە دەبن، چەند کەسانێکیان زیندوو کردەوە کە ئیبلیس کوشتبویانی ، وەڕێ نیشاندەری چەند کەسانێك بوون کە ماڵ و دەرگای خۆیانیان بزر کردبوو تەماشاکەن چاکەیان چەند زۆرە بە سەر خەڵکی یەوە رێگرن بەرانبەر ئەوانەی کە دەیانەوێت دین بگۆڕن و بیدعەی بیدعەچییەکان پوچەڵ دەکەنەوە ، ئەوانەی کە فیتنە بڵاو دەکەنەوە و دوو بەرەکی لە قورئاندا دروست دەکەن وە شت دەڵێن بە ناو خوداوە و بە سەر خوداوە ، پاکی و بێ گەردی بۆ خوای گەورە کە ستەمکاران بە وتنی ئەو قسە کە دەیکەن (عما یقول الظالمون علوا کبیرا) وە قسە کردن لە کتێبەکەیدا بە بێ زانیاری ، پەنا دەگرین بە خوا لە هەموو فیتنەیەکی لە رێ لادەر بێت ، وە سەڵات و سەلام لە سەر پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی ......

أما بعد .....

خوای گەورە ئێمەو ئێوەش موفەق بکات بۆ هەر شتێك کە خۆی پێی رازییە ، و دوورمان بکاتەوە لە هەر شتێك کە تووڕەیی ئەوی تیادایە وە کاری (خاشع) ەکانمان پێ ببخەشێت کە خوای گەورە دەناسن و خۆی بەر پرسە ... وە سێتتان دەکەم پێش ئێوە خۆم کە لە خوا بترسن و تەقوای خواتان هەبێت وە دەست بگرن بە ئەهلی سوننەو جەماعەوە وە باش دەزانن ئەوەی کە سەر پێچی کرد چی بە سەر هات و ئەوەی شوێنی کەوت چی دەستکەوت ،

پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) دەفەرموێت : خوای گەورە بەندەیەك دەخاتە بەهەشتەوە بە هۆی سوننەتێكەوە دەستی پێوە گردبێت .

وە فەرمانتان پێ دەكەم (أنْ لا تؤثروا على الله شيئا) چونكە ئەوە كەلامی خوایەو ئەوەی خوا وتبێتی دروستكراونییە و ئەوەی باسی سەدەكانی پێشوو دەكات دروست كراو نییە و ئەوەی كە لە (اللوح المحفوظ)دا هەیە دروستكراو نییەو كێ بڵێت دروستكراوە ئەوا كافرە و ئەوەی بە كافری نەزانێت ئەویش كافرە ، ئەمجار پاش قورئانی پیرۆز سوننەتەكانی پێغەمبەر(ﷺ) دێت ، وە فەرموودە دەربارەی ئەو و هەڵبژێراوەكان لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەمجار (تابعين) ، وەباوەڕ هێنان بەوەی كە پێغەمبەران(سەڵات و سەلامی خوایان لێ بێت) هێناویانە ، وە شوێن كەوتنی سوننەت رزگار بوونە ، سوننەتیش ئەوەیە كە ئەهلی عیلم گێڕاویانەتەوە لە زانا بەرز و بەڕێزەكان ئەوانیش لە زانا بەرز و بەڕێزەكانەوە ، وە ئاگاداری بۆچوونەكانی (جهم) بن چونكە ئەو خاوەنی بۆچوون و دژایەتییە ، بەڵام (الجهمية) هەموو ئەهلی عیلم كە من بە خزمەتیان گەیشتووم یەك دەنگن لە سەر ئەوەی كە دەڵێن :

(الجهمية) سێ بەشن :

هەندێكیان دەڵێن قورئان كەلامی خوایەو دروستكراوە .وەهەندێكیان دەڵێن قورئان كەلامی خوایە و بێ دەنگ بوون ئەوانە (الواقفه) ن ، وە ئەوانی دی دەڵێن بێژەمان بە قورئان دروستكراوە . ئەوانە هەموو (الجهميه) ن زانایان یەك دەنگن لە سەر ئەوەی كە سەر بڕاوەكانیان حەڵاڵ نییە و نابێت بكرێن بە قازی ، ئیمانیش وتەو كردەوەیە (قول و عمل) زیاد دەكات و كەم دەكات زیاد كردنی ئیمان بە چاكە دەبێت كەم كردنیشی بە خراپە دەبێت ، وەكەسی وا هەیە لە ئیمانەوە دەردەچێت بۆ ئیسلام ئەگەر تەوبەی كرد دەگەڕێتەوە بۆ ئیمان وە لە ئیسلام دەری ناكات تەنها شیرك نەبێت بە خوای گەورە یان ڕەد كردنەوەی یەكێك لە

فەرزەکانی خوا بە بێ باوەری بەڵام ئەگەر لە بەر تەمەڵی و تەوەزەلی بوو ئەوا دەکەوێتە ئارەزووی خوای گەورەوە یان سزای دەدات وە یا لێی خۆش دەبێت وە (موعتەزیلە) هەموو ئەهلی عیلم کە من بە خزمەتیان گەیشتووم یەك دەنگن لە سەر ئەوەی کە بەو کەسە دەگوترێت (المعتزلە) کە بە خاوەن تاوانێك دەڵێن کافر . وەچ کەسێك وا بلێت ئەوا باوەڕی وایە کە ئادەم (علیه الصلاة والسلام) کافرە وەبراکانی یوسف(علیه الصلاة والسلام) کافرن چونکە لە گەڵ باوکیاندا درووییان کرد وە زانایانی (معتزلە) یەك دەنگن لە سەر ئەوەی کە ئەگەر کەسێك دەنکە تۆمێك بدزێت ئەوا لە ئاگردایە ، خیزانەکەی لێی جودا دەکرێتەوە وەحەجەکەی دوو بارە دەکاتەوە ئەگەر حەجی کردبێت ، وە چ کەسێك وابلێت ئەوا کافرە و دەبێت قسەیان لە گەڵدا نەکرێت و سەربڕاوەکانیان نەخورێت تاکو تەوبە نەکەن .

وە (الرافضة) هەموو ئەوانەی (ئەهلی عیلم)ن من بەخزمەتیان گەیشتووم یەك دەنگن لە سەر ئەوەی کە (الرافضة) دەڵێن : علی لە ابو بکر باشترە (خوایان لێ رازی بێت ) وە ئیسلام بوونی عەلی کۆنترە لە ئیسلام بوونی ابو بکر، وەچ کەسێك بلێت عەلی لە ابو بکر باشترە ئەوا قورئان و سوننەتی رەد کردووەتەوە چونکە خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ﴾ (أبو بکر)ی پێش هەموو هاوەڵان خستوە کەچی عەلی پێش نەخستووە ، وەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموویت : ئەگەر هاوڕێیەکی تایبەتیم(خلیل)م هەڵبژێردایە ئەوا ابو بکرم هەڵدەبژارد بەڵام خوای گەورە منی بە هاوڕێی تایبەتی خۆی هەڵبژاردووە ، وە چ کەسێك بلێت عەلی پێش ابو بکر ئیسلام بووە ئەوا هەڵەی کردووە چونکە کاتێك ابوبکر ئیسلام بوو تەمەنی سی و پێنج ساڵ بوو کەچی تەمەنی عەلی حەوت ساڵ بوو کە ئەحکام و سنوور و فەرزەکانی لە سەر نەبووە .

وەدەبێت ئیمانی هەبێت بە قەزاو قەدەر چ خەیری بێت یا شەڕی ، خۆشی و ناخۆشی ، خودای گەورە بەهەشتی دروست کردووە پێش دروستکردنی

خەڵکی و ەخەڵکێکی بۆ دروست کردووە وە خۆشییەکانی بەهەشت بەردەوامن و چ کەسێك بڵێت هەرشتێك لە بەهەشتدا نامێنی ئەوا کافرە ، وەئاگری دروست کردووە و خەڵکێکی بۆ دروست کردووە وە سزاکەی بەردەوامە ، خەڵکانێك لە ناو ئاگردا دەردەکرێت بە شەفاعەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وە ئەهلی بەهەشت خوای خۆیان دەبینن بە چاوەکانیان بە بێ گومان ، وە خوای گەورە لە گەڵ (موسی)دا (علیە الصلاة والسلام) قسەی کردووە بە قسەکردن ، وە(ابراهیم)ی (علیە الصلاة والسلام) هەڵبژاردووە بە هاورێی تایبەتی خۆی (خلیلا) ، وەترازوو حەقە و راستە و سیرات حەقە و پێغەمبەران(سەڵات و سەلامی خوایان لێ بێت) حەقن و راستن ، و(عیسی ی کوری مەریەم) (علیە الصلاة والسلام) بەندەو نێردراوی خوایە ، وەئیمان بە حوض و شەفاعەت و عەرش و کورسی و فریشتەی گیان کێشان کە گیانەکان دەکێشی ئەمجار گیانەکان دەکرێن بە لاشەکانیانەوە پاشان پرسیاریان لێ دەکرێت لە ئیمان و یەکتاپەرستی و پێغەمبەران ، وە ئیمان بە فووکردن بە بووقدا لە لایەن فریشتەیەکی خوداوە کە ناوی (اسرافیل) ە ، وەئەو گۆڕەی کە لە شاری (مدینە) یە گۆڕی پێغەمبەری نازدارە (ﷺ) ئەوانەی تەنیشتی (ابو بکر و عومەر)ە خوایان لێ رازی بێت،وە دڵی بەندەکان لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خوای گەورەدایە ، وە دەجال دەردەچێت لەم ئوممەتەدا بە بێ گومان و (عیسیی کوڕی مەریەم) (علیە الصلاة والسلام) دادەبەزێتە سەر زەوی و لە دەرگای ( لد ) دەججال دەکوژێت . وە ئەوەی زانایانی ئەهلی سوننە فەرموویانە خراپە ئەوا خراپە ، وەئاگاداری هەموو بیدعەیەك بن ، وەپاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ کەسێك نییە لە ابو بکر باشتر بێت و نایشبێت ، وەپاش ابو بکر کەس نییە لە عومەر باشتر بێت و نایشبێت وە پاش عومەر هیچ کەسێك نییە لە عوسمان باشتر بێت و نایشبێت .

وەدەمانگوت (ابو بکر و عومەر و عوسمان) و بێ دەنگ دەبووین لە عەلی کاتێك فەرموودەکەی (ابن عمر) مان پێ گەیشت دەربارەی (التفضیل) ، والله ئەو چوارە خەلیفەی خوان ( راشدین و مهدیین) ، وە شایەتی دەدەین بۆ ئەو دە کەسە کە لە بەهەشتدان کە ئەوانیش ئەمانەن : (أبو بکر و عمر و عثمان و علي و طلحة و زوبیر و سعد و سعید و عبدالرحمن بن عوف و أبو عبیدة بن الجراح) ،وەچ کەسێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شایەتی بۆ دابێت کە لە بەهەشتدایە ئەوا ئێمەش شایەتی بۆ دەدەین ، وە دوو دەست بەرزکردنەوە لە نوێژدا خەیر و چاکەیە، و دەنگ بەرز کردنەوە بە وشەی(آمین)کاتێك ئیمام دەڵێت( ولا الضالین) خەیرو چاکەیە، وە دوعا کردن بۆ پێشەوای موسڵمانان بە چاکەو دەرنەچوون و رووبەروو بونەوە بە روویاندا بە شیر و شەڕ نەکردن لە رۆژی فیتنەدا ، وەنابێت پشتگیری هیچ کەسێ بکات کاتێ دەڵێن فلان کەس لە بەهەشتدایە یا خود فلان کەس لە دۆزەخ دایە تەنها ئەو دە کەسە نەبێت کە پیغەمبەری خوا (ﷺ) موژدەی بەهەشتی پێ داون . وە وەسفی خودا دەکەین چۆن خۆی وەسفی خۆی کردووە وە نەفی لەوە دەکەین کە خۆی نەفی لێ کردووە ، وە ئاگاداری جیدال بن لە گەڵ ئارەزوو پەرستان دا و دوور بکەونەوە لە خراپەی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) وباسی نەکەین و تەنها باسی چاکەیان بکەین ، وەهەر دووبەرەکییەك لە نێوانیاندا بوو باسی نەکەین وە پرس بە ئەهلی بیدعە نەکرێت لە دیندا ، وەهیچ مارە برینێك نابێت بە بێ ئامادە بوونی خاوەن کچ و دوو شایەت ، وە ژن هێنان بە شێوەی (المتعة) حەرامە تا رۆژی دوایی وە نوێژ کردن لە پشت هەموو ئیمامێکی خراپ و باشەوە ، وەنوێژی جومعە و هەردوو جەژن و نوێژکردن لەسەرهەموو ئەهلی قیبلەیەك کەدەمرێت وە حیسابی لە سەر خوا وەدەرچوون لە گەڵ هەموو پێشەوایەکی موسڵماندا لە کاتی جەنگدا یا لەحەجدا وە تکبیر کردن لە نوێژی مردوو دا چوار (الله اکبر)ە بەڵام ئەگەر ئیمام

پێنج (الله اكبر)ی كرد ئەوا تویش دەیكەیت چونكە علي بن ابي طالب پێنج(الله اكبر)ی كردووە ابن مسعود فەرموویەتی:ئەگەر ئیمام چەند (الله اكبر)ی كرد ئەوا تویش ئەوەندە بكە . بەڵام (ئیمامی شافعی) لە گەڵ مندا یەك دەنگ نییە و فەرموویەتی : ئەگەر لە چوار (الله اكبر) زیاتر بوو ئەوا دەبێت نوێژەكەی دوو بارە بكاتەوە ، وەبەڵگەی ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوار (الله اكبر)ی كردووە كاتێك نوێژی لە سەر مردوویەك كرد،وە مەسح لە سەر خوف بۆ (مسافر) سێ رۆژ و شەوە و بۆ (مقیم) یەك شەو رۆژە ، وەشەو نوێژ دوو ركات دوو ركات دەكرێت وەهیچ نوێژێك پێش نوێژی جەژن نییە وە ئەگەر چویتە مزگەوتەوە ئەوا دامەنیشە تاوەكو دوو ركات نوێژی (تحیة المسجد) دەكەیت ، وەنوێژی (وتر) یەك ركاتە وقامەت فەرزە ، وەئەهلی سوننەم خۆش دەوێت هەر شتێكیان كردبێت خوا لەسەر ئیسلام و سوننەت بمانمرێنێت و عیلم و زانستمان پێ ببەخشێت و موفەقمان بكات بۆ ئەوەی كە خۆی پێی خۆشەو پێی رازیە[٣٠٤] .

لێرەدا نامەكە تەواو دەبێت ئەگەر ئێمە بەوردی نامەكە بخوێنینەوە دەبینین ئەم نامەیە پڕە لە تەمی و ئامۆژگاری و فێر كردنی موسڵمان بۆ بنەماكانی دینەكەی و فیقه وچۆنێتی نوێژ و قسەكردن دەربارەی كۆمەڵە گومڕاكان و كۆمەڵی ئەهلی سوننە و جەماعە ودەیان رێنمایی دی كە كەم كەس دەتوانێت لە نامەیەكی وا بچوكدا جێگای ئەو هەموو زانستە بكاتەوە .

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت : لای ئێمە بنەماكانی سوننەت ئەوەیە كە دەست بگریت بەوەی كە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) لە سەری بوون و شوێنكەوتنیان ، و دوور كەوتنە لە بیدعە چونكە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە وە دوور كەوتنەوە لە (مراء) و (جیدال) و دژایەتی كردن لە دیندا .

---

(٣٠٤) المناقب:( ١٧١).

وە سوننەت لای ئێمە شوێنەواری پێغەمبەرە (ﷺ) وە سوننەت قورئان شی دەکاتەوە و رێبەری قورئانە ، و لە سوننەت دا قیاس نییە وە نمونەیان لە سەر ناهێنینەوە و بە عەقڵ و ئارەزوو مامەڵەی لە گەڵدا ناکەین بەڵکو ئەوە شوێنکەوتنەو وازهێنانە لە ئارەزوو ، وە لەو سوننەتانەی کە چ کەسێك وازی لێ بهێنی و پێی رازی نەبێت هەرچەندە ئیمانی پێی هەبێت ئەوە لە ئەهلی نی‌یە ئەویش: ئیمان بە قەدەر خەیر وشەڕی و باوەڕ هێنان بەو فەرموودانە کە دەربارەی هاتوون نابێت بڵێیت بۆ ؟ چۆن ؟ بەڵکو ئەوە باوەڕو ئیمان هێنانە پێی ، وە چ کەسێك شی کردنەوەی فەرمودەیەکی نەزانی بەڵام بە عەقڵ لە یەکی دایەوە ئەوا بەسییەتی و حوکمی لە سەر داوە و لە سەرێتی ئیمان هێنان پێی و تەسلیم بوون ، وەکو فەرموودەکانی راستگۆی باوەڕ پێکراو ( الصادق المصدوق) وە نمونەی ئەو لە سەر قەدەرو فەرموودەی بینینی خودا بەڵکو ئیمانی پیێ بهێنیێ و یەك پیت رەد نەکاتەوە [٣٠٥] ...

## سەرچاوەکان

١. العصر العباسي الأول أو ( القرن الذهبي في تاريخ الخلفاء العباس) / د . عبد المنعم ماجد .
٢. طبقات الحنابلة / القاضي أبي الحسين محمد بن أبي يعلى /مطبعة السنة المحمدية/١٣٧١-١٩٥٢.
٣. مناقب الامام احمد بن حنبل /الحافظ أبي الفرج عبد الرحمن بن الجوزي / الطبعة الأولى /مطبعة السعادة –مصر.
٤. ابن حنبل حياته وعصره ، آراءه وفقهه/ محمد أبو زهرة.

[٣٠٥] المناقب :( ١٧١-١٧٧) .

٥. البداية والنهاية /الحافظ ابن كثير
٦. الأئمة الاربعة /أحمد الشرباصي
٧. علوم الحديث ومصطلحه ، عرض ودراسة / د. صبحي صالح/ مطبعة جامعة دمشق .
٨. الحديث والمحدثون أو عناية الأمة الأسلامية بالسنة النبوية /محمد محمد ابو زهرة /الطبعة الأولى /١٣٧٨-١٩٥٨/ مطبعة مصر — مصر .
٩. مباحث في تدوين السنة المطهرة / أبو اليقظان عطية الجبوري/ المطبعة العربية الحديثة / القاهرة — مصر .
١٠. حلية الولياء /
١١. سير اعلام النبلاء/الامام الذهبي
١٢. تاريخ بغداد/ الخطيب البغدادي.

# ناوەڕۆك

